# مشك
# و
# بنیادەم

## جۆن شتاینبێک


وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

ئەدیب نادر




ڕۆمان

# مشك و بنيادەم

جۆن شتاينبێك

وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە
ئەدیب نادر

هەولێر - ۲۰۱۱



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی



وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر


- **(رۆمان)**
- **(مشك و بنیادەم)**

---

- نووسینی: جۆن شتاینبێك

---

- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئەدیب نادر

---

- نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر

---

- بەرگ: جێگر عەبدولجەبار

---

- نرخ: (٢٥٠٠) دینار

---

- چاپی یەکەم : ٢٠١١

---

- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

---

- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)

---

- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٢٢٤٤) ساڵی(٢٠١١)ی پێ دراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٥٢٨)**

**ئەم کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**

**رۆشنبیری لەسەر ئەم ماڵپەڕە بخوێنەوە**

**www .Kurdchap.com**

**ماڵپەڕ: www.mukiryani.com**

**ئیمەیل: info@mukiryani.com**

# جۆن شتاینبێك:

## کورته بەیۆگرافییەك

لـە دایکبـوو لـە سـالیناس، کالیفۆرنیـا، لـە سـاڵی ١٩٠٢، جـۆن شـتاینبێك لـە دۆڵێکـی کـشتوکاڵیی بـەپیت و بەرەکەتـدا نەشـونمای کـرد کـە بیـست و پێـنج میـل لــە ڕۆخ و کــەناری ئۆقیانووســی پاســەفیکەوە دووربــوو- دۆڵەکــەو کــەناری ئۆقیانووســی پاســیفیکیش دواتــر بوونــە ڕووداوگــای هەنــدێك لــە باشــترین ڕۆمانــەکانی. لــە ســاڵی ١٩١٩ دا بــۆ زانکــۆی ســتانفۆرد ڕۆیــشت و تیایــدا ناوبـەناویی خـۆی لـە کۆرسـەکانی ئـەدەبیات و نووسـیندا نـاونووس کـرد و هـەتا کـاتی بـەجێ هێـشتنی لـە سـاڵی ١٩٢٥ دا تیایـدا مایـەوە بـە بێئـەوەی بڕوانامـەی زانکـۆی وەدەسـت هێنـابێ. لـە مـاوەی پێـنج سـاڵی دوای ئـەوەیش شـتاینبێك بــەکارکردن وەکــو کارگــەرو ڕۆژنامــەوان لــە نیویــۆرك ســیتی دا بــژێوی خــۆی پەیـداکردو بێلێـبڕ سـەرقاڵی نووسـینی یەکـەمین ڕۆمـانی خـۆی بـوو؛ کـە ئـەویش ڕۆمــانی کــووپی زێــڕین (١٩٢٩) بــوو. پــاش هاوســەرگیری کــردن و مــاڵ گواســتنەوەی بــۆ پاســیفێك گــرۆڤ، دوو ڕۆمــانی کالیفۆرنیــایی بلاوکــردەوە، کــە ئــەوانیش پاوانــەکانی بەهەشــت (١٩٣٢) و بــۆ خودایــەکی نەناســراو (١٩٣٣) بـوون و هـەر لـەو ماوەیەشـدا خـەریکی نووسـینی کۆمـەڵێك کورتـە چیرۆك بـوو کـە دواتــر لــە کۆچیرۆکی "دۆڵێکــی دووررودرێــژ" دا کۆکرانــەوە کــە لــە ســاڵی ١٩٣٨ دا بلاوبــووەوە.بــەلام ســەرکەوتنی ســەرتاپاگیرو متمانــەی دارایــی تــەنها لەگــەڵ

ڕۆمـانی تورتێیا فـلات دا دەسـتی پێکـرد کـە کۆمەڵـە حیکایـەتێك بـوو سـەبارەت بە جوتیارەکانی مۆنتێری و لە ساڵی ١٩٣٥ دا بلاوکرایەوە.

شـتاینبێك کـە بەدرێـژایی پیـشەکەی خـۆی تاقیگـەرو ئـەزموونکارێکی بێووچـان و بـەردەوامبوو، هـەردەم ڕێـڕەوی خـۆی دەگـۆڕی. ئـەو لـە هەرسـێ ڕۆمـانی بـەهێزو کاریگـەری دوا دوای سـالأنی ١٩٣٠ یەکانیـدا. کـە ئـەوانیش: ڕۆمـانی لـە شـەڕێکی گومانئـامێزدا (١٩٣٦)، ڕۆمـانی مـشك و بنیـادەم (١٩٣٧) و ئـەو ڕۆمانـەیش کـە لـە لایـەن زۆرینەیەکـەوە بـە باشـترین کـاری ئـەدەبی ئـەو لـە قەڵـەم درا: ڕۆمـانی هێـشووەکانی تـووڕەیی (١٩٣٩) کۆنـسێنترەی کـردە سەرچـینی کرێکـاری کالیفۆرنیـا. لەسـەرەتای سـالأنی ١٩٤٠ کانیـشدا، شـتاینبێك لـە ڕۆمـانی "دێیـەکی لـەبیرکراودا (١٩٤١) بـوو بـە فلیمـساز و لـە ڕۆمـانی "دەریـای کـۆرتێز" یـشدا (١٩٤١) بـوو بـە خوێنـدکارێکی جیـددی و گوێڕایـەڵی مـارین بـایۆلۆگی. ئینجـا سـەرجەم کاروخزمـەت و نووسـینی خـۆی بـۆ جـەنگ تـەرخان کـردو ئـەم ڕۆمانانـەی نووسـی: بۆمبابارانـە بێووچـانەکان١٩٤٢، نۆڤلێتـە — شـانۆ نامەییـە مـشتومڕ ورووژێنەرەکـەی مـانگی ئـاوابوو "١٩٤٢"، هـەراو زەنـای کاننـەریی "١٩٤٥"، پاسـەکەی وەیـوۆرد "١٩٤٧"، مـرواری "١٩٤٧" یاداشـتە ڕووسـییەکان" ١٩٤٨" و درامایـەکی دیکـەی ئەزموونگـەرایش: سـوتانێکی درەوشـەدار (١٩٥٠) هـەروەها ڕۆمـانی "یاداشـتنامەیەك لـە دەریـای کـۆرتێزەوە." (١٩٥١) کـە پـێش ڕۆمـانی جاویـدانی ڕۆژهـەلاتی عـەدەن (١٩٥٢) بلاوکرایـەوە کـە داسـتانێکی بـەرزەفڕی دۆڵـی سـالیناس و مێـژووی ماڵبـات و خانەوادەکـەی خـۆی بـوو. دوا دەیەسـاڵەکانی ژیانیـشی لەگەڵ ژنـی سـێیەمیدا بەسـەربرد کـە لـە نیویـۆرك سـیتی و سـاگ هاربـەردا گەشـتێکی زۆری لەگەڵـدا دەکـرد. کتێبـەکانی دواییـنیـشی بـریتین لـە: پێـنج شـەمەی خـۆش(١٩٥٤)، فـەرمانڕەوای کەمخایـەنی پیپینـی چـوارەم: چـیرۆکێکی هەڵبەسـتراو (١٩٥٧)، جارێـك جـەنگێك بـەرپابوو

(١٩٥٨)، زستانی نارەزایی ئێمە (١٩٦١)، گەشتگەلێك لەگەڵ چارلێدا بۆ دۆزینەوەی ئەمەریکا (١٩٦٢)، ئەمەریکا و ئەمەریکییەکان (١٩٦٦) و هەروەها ئا ئەم کتێبانەیش کە لەپاش مردنیدا بلاوکرانەوە:

یاداشتەکانی ڕۆمانێك: نامەکانی "ڕۆژهەلاتی عەدەن" (١٩٦٩)، ڤیڤا زاپاتا (١٩٧٥)، ڕەفتارەکانی شا ئارسەرو شۆڕە سوارە نەجیبزادەکانی (١٩٧٦) و هەروەها ڕۆژەکانی ئیشکردن: یاداشتەکانی ڕۆمانی "هێشووەکانی تووڕەیی (١٩٨٩). شتاینبێك کە لە ساڵی ١٩٦٢ دا خەلاتی نۆبلی ئەدەبیاتی بەدەست هێنابوو، لە ساڵی ١٩٦٨ دا کۆچی دوایی کرد.

# پێشەکی

## پرۆفیسۆر سوزان شیلینگلۆ

جۆن شتاینبێك، لە ژیان و لە ڕۆمانەکانیشیدا ستایشی دۆستایەتی دەکردو بەرز رایدەگرت. هەموو بەیانییەك بەرلەوەی دەست بە نووسین بکات، سەروەر نامەی بۆ هاوڕێکانی دەنووسی و ئەو هەموو کاغەزە قەبارە گەورەو ئەستوورانەیش کە زۆربەیان هێشتا بلاّونەکراونەتەوە، نەخشەی رووخسارو شەقڵی زیندەگانی و هونەرەکەی ئەو دەکێشن. دۆستیی لە ناوازەترین کاری ئەودا جاویدانترین پابەند بوون و وابەستەگییە و ئەو فاکتەشە کە بە مەحکەمی و پتەویی لەنێو ترادیسیۆنی بەردەوامی ئەو نووسەرە ئەمەریکییانەدا جێگیری دەکات کە پیاو لەگەڵ پیاودا بە جوتە بۆ نێو سەرزەمینە کەشف نەکراوەکان دەنێرن. بەلاّم لە باردی هاوڕێیەتییەوە دیدی شتاینبێك کەمتر بەوە دیاریکراوە کە هەلاّتن بێت لە هاوسەرگیریی و ماڵ و پەیوەست بوون وەك لەوەی دۆزینەوەی مەرزەکانی کۆمەڵگاو خود بێت. شتاینبێك لە دەستپێکی یاداشتێکدا کە لە ساڵی ١٩٣٨ دا نووسیویتی دەڵێت: " لە هەموو پارچە نووسینێکی ڕاستگۆیانەی دنیادا بابەتێکی سەرەکی و بنچینەیی هەیە. تەقەللای ئەوە بدەن لە مرۆڤ حاڵی بن، ئەگەر لە یەکدی تێبگەن ئەوا بۆ یەکدی میهرەبان دەبن. بەباشی ناسینی مرۆڤ هەرگیز نابێتە هۆی ڕق و کینە، بەڵکو بەردەوام دەبێتە هۆی خۆشەویستی. چەنددها مەبەستی

بچووکتریش لە نووسیندا هەن. نووسین هەیە برەو بە گۆڕانکاری کۆمەڵگا دەدات، نووسین هەیە بێدادی و زوڵم و ستەم بە سزا دەگەیەنێت، هەشە تەعزیەی پاڵەوانگەرایی دەکات، بەڵام هەمیشە ئەو بابەتە سەرەکی و بنچینەیی یەی تێدایە. هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی لەیەکتری تێبگەن." ئەم پەیڤانە شەقڵگیریی بەپێشە درێژخایەنەکەی ئەو دەبەخشن و بێ چەندو چوون لە گوتاری قبوولکردنی خەڵاتی نوبڵی ئەدەبیاتی ساڵی ١٩٦٢ شیدا ڕەنگدەدەنەوە. گەورەیی و مەزنایەتی شتاینبێك وەکو نووسەرێك لەو هاوسۆزییەدا سەقامگیرە کە ئەو بۆ خەڵکی سادە و هەرەمەکی.. بۆ تاق و تەنیایی و خۆشی و شادی و تووڕەیی و هێزو توانایان، بۆ پابەندبوونیان بە جێگاو شوێنەکانەوەو تاسەو ئارەزووی بێڕادەیان بۆ زەوی و زار، هەیبووە. "مشك و بنیادەم" و "هەراوزەنای کانن‌ەریی" ڕەنگە بەپێزترینی کورتە ڕۆمانەکانی ئەوبن، کە لە دڵکێشی و برەو زۆر پەیداکردنیان قەرزارباری توانا و بەهرەی شتاینبێکن لە ڕێکخستن و هەماهەنگ کردنی ئەو پێکداچوون و ئاڵۆزکانەی بیرۆکە سەرەکییەکە هەر لەنێو ڕێزبەندیی ئەو پابەندبوونە هەمیشەییەی نێوان هاوڕێکان کە ئەویش خۆشەویستییە لە بالاترین چڵەپۆپەیدا.

دەربڕینی ئەو گوزارشتە وەکو ئەوە وابوو کە خەتەرناکانە بە تەنیشت پەرتگای هەست و سۆزدا هەنگاو بنێت، کە ئەوەیش حوکمدانێك بوو کە ڕەخنەکاران فرە و پەیدەرپەی ڕووبەڕووی شتاینبێکیان دەکردەوە. ئێدمۆند ویلسن، کە یەکێکیان بوو، لە وتارێکی ساڵی ١٩٤٠ یدا ئەوەی ڕاگەیاند کە کاراکتەرەکانی نووسەر زۆر زیاتر ئاژەڵ بوون وەك لەوەی مرۆڤ بن. ئەوەیش بیروڕایەك بوو بە درێژایی چەندین دەیە ساڵ گیرایەبەر. ڕەخنەگرە هاودژەکان — کە ڕۆمانەکانی شتاینبێك لە ئاکامدا کۆمەڵە پەرچەکردارێکی زۆر جیاوازیان هێنایەکایەوە — جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەو هەست و سۆزانەی کە کارەکانی دەرخواستیان دەکرد زیادەڕەوو میلۆدراماتیکی بوون،

لـه ڕاستیـشدا بـۆ ئـەو کاراکتـەرە بـە سـاکاریی وێنـە کێـشراوانەی ئـەو گـەلێك چـڕوپڕو توندوتیـژبوون. هـەر چـۆنێکیش بێـت، ئـەو هەسـتانەی کـە لـە نایـابترین ڕۆمـانی شـتاینبێکدا خرۆشـێنراو و دنـەدراون بـە شـێوازێکی بابەتییانـەی توندوتۆڵ ڕکێف کـراون و بـەو وریـایی و بـە ئاگابوونـەی نووسـەر لـەبارەی تـەنیایی ڕاسـتەقینەو تراژیـدیای ئەمەریکییـە بـەش خـوراو و بێدەرەتانەکانـەوە زاخـاو دراون. بـۆ خوێندنـەوەی ڕۆمـانی "مـشك و بنیـادەم" هـەروەکو ئـەوەی کـە شـتاینبێك مەبەسـتی بـوو لـە هـزردا بـە مەحکـەمی پارێزگـاری لـە ناونیـشانە ئۆریژینالەکـەی بکرێـت، کـە ئـەویش: " ئـەو شـتەی کـە ڕوویـدا" بـوو، ئـەو دەسـتەواژەیەی کـە تـابیر لـەو قایلبوونـە بـێ حوکمدانـە دەکـات کـە باشـترین کـاری سـاڵانی ١٩٣٠ یـەکان و سـەرەتای سـاڵانی ١٩٤٠ کـانی ئـەو مـۆرزەدە دەکـات. ئـەوی ڕاسـتی بێـت شـتاینبێك لـە ڕۆمانەکـەدا ئـەوەمان پێـدەڵێت کـە شـتەکان ئـا بـەم شـێوەیەن، ئـەو شـێوەیەی خۆیـشی بـە تێفکرینێکـی نـا – ئەنجامگـەرا یـاخود "هەرتـەنها بـە تێفکرینێـك" نـاوزەدی کـرد. زاراوەی نـا – ئەنجامگـەرایش لەلایـەن باشـترین هـاوڕێی شـتاینبێك خۆیـەوە داتاشـرا، کـە ئـەویش ئێـدوارد. ئێـف. ڕیکێـتس بـوو، هـەروەکو چـۆن ئـەم دوو پیـاوە فەلـسەفەی هاوبەشـی خۆیـان بـە ڕوون و ئاشـکرایی دەربـڕی، ئاوەهـایش جـەختیان لەسـەر پێداویـستی ئـەوە کـردەوە کـە وەکـو زانـا پێویـستە بـە ڕوون و ئاشـکرایی شتەکان ببیـنن: کـە ئـەو بینینـەیش قبـوولکردنی ژیانـە پێبـەپێی هەلومەرجـەکانی خـۆی." تێفکرینێـك " کۆنـسێنترەی لەسـەر ئامانجـەکان نـەدەکرد، بـەڵکو کۆنـسێنترەی لەسـەر پرۆسـەی خـودی ژیـان دەکـرد، کۆنـسێنترەی لەسـەر ئارمـانی کـارکردنی سروشـتی ئەریـستۆتالییانە دەکـرد. کـاتێ کـە ڕۆمـانی "مـشك و بنیـادەم" دەخوێنینـەوە، خواسـتە لەسـەرمان کـە دان بـە حەقیقەتی ئـەو بارودۆخـەدا بنـێین کـە تیایـدا دوو پیـاو، هەریەکـەو بـە کەموکاسـتییەکی نـاوازەو نەدارییـەوە خـۆ بـە پـەراوێزی جیهـانێکی نابەخـشندەو لێبـووردن نەناسـەوە هەڵدەواسـن. ئەمـە سـەربوردەیەکە

لــەبارەی پابەندبوونـــەوە، تەنیاییـــەوە، ئاواتـــەخوازی و زەرەرو زیانـــەوە و لـــەو هەقیقەتەشـەوە هێـزی خـۆی هەڵـدەهێنجێ کـەوا ئـەم ڕاستییە جیهانگیرانـە لـەنێو کۆنتێکسـتی واقیعییانـەی دۆسـتایەتی و خـەونێکی هاوبەشـدا بەرقـەرارن. هـەر وزەو توانـای ئـەو دۆستایەتییەشـە کـە تەگەرچـی ڕاستەقینەشـە، بـەڵام هـەر هێنـدە هەسـت و سـۆزدارە کــە ئـەم تێکسـتە هێجگـار هەسـتئەنگێزو نیلهامبەخـشە بارگاویی دەکات.

ڕۆمـانی "مـشك و بنیـادەم" لـە تریلۆجییەکـەی "سـێیینەکەی" شـتاینبێك دا کتێبـی ناوەڕاسـتە، کـە سـەبارەت بـە کرێکـاری کـشتوکاڵییە لـە کالیفۆرنیـادا. هــەر دەم و دەســت پــاش تــەواوکردنی ڕۆمــانی ســەرنج ڕاکێــشی خــەبات و مــانگرتنی "نەشـەڕێکی گومانئـامێزدا" لەسـەرەتای مانگـەکانی سـاڵی ١٩٣٦ دا دەسـتی بـە نووسـینی دەستنووسـەکەی کـردو دەستبەجێیش بـەر لـە دەسـتپێکی پـاییزی سـاڵی ١٩٣٦ و ئـەو بەدواداچـوون و لێکۆڵینەوەیـەی کـە لـە مـانگی ئـازاری سـاڵی ١٩٣٩ دا بـوو بـە هـەوێنی بەرهـەمهێنان و چـاپ و بڵاوکردنـەوەی ڕۆمـانی "هێـشووەکانی تـووڕەیی"، کــە جاویــدانترین ڕۆمــانێتی دەرهــەق بــە کۆچـبەرانی وشکەســاڵی و قــاتوقڕی لــە کالیفۆرنیــادا. دەقــە لاوەکییــەکانیش، هــەروەکو بـە ناونیـشانەکانی "بەهەشـتی ونبـوو" و "سـرووتی جـەنگی کۆمـاری" دا دەردەکـەوێت، چـەردە بەرپەرچـدانەوەیەکی داسـتانین بـۆ کێـشەو گرفتـە تونـدو تیـژەکانی کرێکـاری مـەزرا لـە کالیفۆرنیـادا، ئـەو جـێ و شـوێنەی کـە مـەزرا گـەورەو فراوانـەکانی بـۆ ماوەیـەکی درێژخایـەن پـەیجۆری کۆمەڵـە کارگـەرێکی وەرزیـــی و گـــەڕۆکیان کـــردووە بـــۆ ئـــەوەی بـــەروبوومی وەرزیـــی دروێنـــە و کۆبکەنـــەوە. هـــەروەکو بیـــشڵێیت مـــەوداو تـــانۆپۆی گرفـــت و ئاریـــشەکانی کارگەرانی کالیفۆرنیا دەرخواستی زەمینەیەکی بێهاوتای لەو بابەتە بکەن.

لـە سـاڵانی ١٩٣٠ یەکانـدا کێـشمە کـێش و ناکۆکییـەکان لـەنێوانی کاروبـاری بازرگـانیی و کـشتوکاڵیی هەرێمەکـە و کارگـەرە کـشتوکاڵییە کـەم دەرامـەت و

چەوساوەو تەقریبەن ناچیزە و پێوارەکاندا گەلێك زیادیان کرد. هەر لە دەستپێکی ئەو دەیەساڵەیشدا مانگرتنەکان هەڵگیرسان و سەرۆکەکانی کارگەرە کۆمۆنیستەکان بۆ ئۆرگانیزەکردنی کارگەرەکان کەوتنە کارو جموجوڵ. لە ساڵی ١٩٣٥ یشەوە تاوەکو ساڵی ١٩٤٠، دەربەدەرو سورگومەکانی باشووری خۆرئاوای قاتوقڕاویی و موسیبەت زەدە هەڵڕژانە نێو هەرێمی زێڕینەوە، چونکە بەو بیروباوەڕە ئەمەریکییە هوەر لەزەمانی زووەوە وەبەرگیراوە کارتێکراوبوون کە دەیوت خۆرئاوا! سەرزەمینی خێرو خۆشی و گفت پێدراوە - شوێنی سەر لە نوێ دەست پێکردنەوەیە - و هەروەها بە ناواتێکی نێجگار پتەوو کۆنکرێتی ئیش پەیداکردن لەنێو بێشەلانەکانی دار پرتەقاڵ و کێڵگەکانی کاهووەوە کارتێکراوبوون. پتریش لە ٣٥٠ هەزار کۆچبەری قاتوقڕیی و وشکەساڵیی لە ئۆکلاهۆماو ئارکانساس و تێکساسەوە لە ساڵانی ١٩٣٠ یەکاندا بۆ کالیفۆرنیا هاتن و کاروباری بازرگانیی هەرێمەکەیش پێینەدەکرا بە ئاسانی ئەو هەموو پەناهەندانە ودەر ئیش بخات، هەتا لەسەر گەورەترینی ئەو پارچە زەوییانەیشدا نەدەکرا جێ بکرێنەوە کە زۆربەی هەرە زۆری خۆراك و نازووقەی سەرجەمی نەتەوەکەیان وەبەردەهێنا. بۆیە لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٣٠ یەکانەوە هەتا ١٩٤٠ (کاتێ کە کرێکارگەلێکی بێ ئیش و کاری زۆر، لە پیشەسازی بەرەڤانی بوژاوە و گەشەسەندوودا کەوتنە ئیش دەستەبەرکردن) کۆچبەرەکان بەبێ سەروەت و حەسانەوە بەسەروخواری هەرێمەکەدا جێگۆڕکییان دەکرد، چونکە ئامەزروی ئیش کردن بوون و چاوەڕوانی ئەوە بوون کە بەروبوومەکان پێبگەن. ئەوی راستیش بێت ساڵی ١٩٣٦ ئەو کاتە بوو کە گەلێك لە هاوڵاتییە نیشتەجێیە کالیفۆرنیاییەکان کەوتنە وەئاگاهاتنەوە لەو کێشەوگرفتە توندو تیژەی بەدەستیانەوە بوو: ئەو کێشە و گرفتەیش هاتنی بە لێشاوو پەیتا پەیتای خانەوادە سپی پێستەکان بوو، کە ئەگەرچیش بێ ڕێوجێ و برسی و لێقەوماوبوون بەلام سەربەرزو شکۆداربوون.

ئـەو کتێبـەی کـە شـتاینبێك لـەو سـاڵەدا نووسـیی، هەرچۆنێك بـێ، لـە بـارەی توانـا و بەرهەڵـستی کردنـی دەسـتەبژێرە موڵکـدارەکانی کالیفۆرنیـا نـەبوو هەمبـەر بـەو هەڕەشـە نابوورییـەی کـە تـازە هاتووەکـان دەیاننواند، هـەروەها لـەبارەی پەناهەنـدەی هەرێمـە قـاتوقڕ و سیاسـاڵەکانیش نـەبوو کـە بارگـەو بنـەو هۆیـەیان لـە قـەراخی ڕێگاکانـدا، لـە هووڤـەر ڤیلـە قەرەباڵغـەکان دا، لـە ئۆردووگـا پـیس و چـەپەڵەکاندا هەڵـدابوو، چـنگیان لـە دەسـتپێکێکی نـوێ گیردەکـرد. ڕۆمـانی " مـشك و بنیـادەم " تـا ئەندازەیـەك تێکـستێکی ئاناکرۆنیـستیکە (هـاودژو نـەگونجاوە لەگـەڵ مێـژوودا – وەرگێـڕ) و پـێ فـشاریی لەسـەر هونەرکارییەکـەی خـۆی دەکـات، نـەك لەسـەر مێـژوویی بـوونی خـۆی. شـتاینبێك قەتاوقـەت مێـژوو نووسـێکی کۆمەلایـەتی راسـتەقینە نـەبووە، بـەڵکـە خـۆی بەدەسـت ئەنقەسـت هەریـەکێ لـە ڕۆمانـەکانی سـالانی دوادوای ۱۹۳۰ یـەکانی لـە مێـژوو دادەبڕێـت و هـاودژی لەگەڵـدا دروسـت دەکـات. ئەگـەر چـی ئـەو خـۆی لـە ڕۆمـانی "ئەشـەڕێکی گومانئـامێز دا" بـە مەبەسـتی ئـەوەوە دەسـتی پێکـرد کـە بـە لایـەنی کەمـەوە " بـەیۆگرافیای " ئـەو کۆمۆنیـستە هەلاتووانـە بنووسـێت کە لە دەوروبـەرو قـەراخی دەریـادا خۆیـان حەشـارو مـەلاس دابـوو، بـەلام ئەمـە بـۆ داسـتانی پـڕ لـە کێـشە و گرفتـاریی ئـەو کەللـە ڕەقییـەی مـەزرادارەکان پـەرەی سـەندو دژ بـە تـین و تـاوو حەماسـەتی ئایـدیۆلۆژی و شـپرزە بـوون و هـەژانی سایکۆلۆژی ڕێکخەرانی کرێکاران قەرارگیر بوو.

ئـەم ڕۆمانـە بـەرزە فـرە ڕاسـتگۆیە دەق ئـەوە دەردەخـات کـە شـتاینبێك بـە " بـەر جەسـتە کردنـی بێلایـەنی" خـەبات و مانگرتنێـك نـاودێری کـردووەو هـەر بـەو چەشـنەیش وەکـو باشـترین ڕۆمـانی خـەباتی پرۆلیتاریـای سـالانی ۱۹۳۰ یـەکان دەمێنێتـەوە. ڕۆمـانی "هێـشووەکانی تـووڕەیی" ش، کـە بەرهـەمی هـەوڵ و کۆشـش و لێکۆلینـەوەی "سـێ سـاڵی کۆمـەڵێك دیمانـەو کۆمـەڵێك گەشـت و سـەردانییە بـۆ سـێنتراڵ ڤـالی کالیفۆرنیـا و کۆمـەڵێك بەدواداچـوون و

خوێندنـەوەی وردو بـە دیقـەتی راپۆرتـەکانی ئۆردووگـای دەوڵـەت و مـیری " یـە، نـە ڕۆمـانێکی واقیعگەرایانەیـە و نـەیش تۆمـارێکی مێژووگەرایانـەی سـەردەم و ڕۆژگارێکــە. نەخــشەی نــازارو مەینــەتی ڕۆژانــەی ئــەو هــەژارو بێنەوایانــە دەکێـشێت وەکــو ئــەوەی سەنگوســووژێکی میتۆلۆژیانــە بێــت بــۆ ســەرزەمین و بەهەشـتێکی عــەدەنیی، بــۆ کۆمەڵگایــەکی هیوومـانیی. لەگــەڵ ئەوەیـشدا کــە خوێنـەران بـەردەوام شـتاینبێك بـە قەرەوێڵـەی پرۆکرەسـتیی١ شـتەك دەدەن، وەلێ ئـەو بـە تـەواویی پێبـە پێـی ئـەوە ناگونجێـت. شـتاینبێك، هـەر بـۆ نموونـە، هەمــــەڕەنگیی ئێتنیکیــــی کارگــــەران و هــــەروەها ئامــــادەبوونی ڕێکخــــەرانی کرێکـارە ئافرەتـەکانیش پێـشێل دەکـات، هـەتا ئەگـەر یـەکێك لەوانـە ئـافرەتێکی جحێڵــی بــەتواناو پێــداگری وەکــو کــارۆلاین دێکــەریش بێــت، کــە ڕۆڵێکــی زۆر گرنگــی لەمانگرتنــەکانی ســەرەتای ســالآنی ١٩٣٠ یــەکان دا بینــی. لــە راستیــشدا، هەرسـێ دەقەکــە زۆر وریایانــەو ئاگادارانــە سـیمبۆلێن وەکــو لــەوەی مێـژوویی بـن، هـەروەکو شـتاینبێك خۆیـشی پـەی پێـبردو دانـی پیادانـا. هـەر بـەر لەدەسـت پێکردنـی ڕۆمـانی "هێـشووەکانی تـووڕەیی " یـش لـە یاداشـتنامەکەی خۆیـدا بـە پـوختی بیروبـاوەڕە هونەرییەکـەی خـۆی دەربـڕی. کەتیایـدا دەڵێـت: " نووسەری پەیوەندار، نابێ بەتەڵەوداوی ئایدیۆلۆژیا سیاسییەکانەوە گیربێت":

کۆمۆنیـــستەکان ئــەو ئەهریمەنانــەن کــە دەیانــەوێت ئــەو خــانووە گەچــکاری کــراوە بــچکۆلەیەی کارمەنــدی دووکــانی بەقاڵییــەك بــدزن و ژنەکــەی ئاراســتە بکـــەن و منداڵەکانیـــشی بـــۆ کارگـــەی ســـاوایانی ویلایـــەتێك بـــدزن... پیـشەسازگەراکانیش ئـەو ئاژەڵـە دڕنـدە دڵـڕەق و چاوچـنۆکە تەنگەسـتوورانەن کـە چــێژو لــەزەت لــەبۆردوومانکردنی کارگــەرانی خۆیــان هەڵــدەهێنجن. پرۆســەی

---

١ Procrust : دزێکی ئەفسانەیی گریکی بوو لە سەر قەرەوێڵەکەی خۆیدا قوربانییەکانی دادەناو بە گوێرەی ئەوە درێژییانی دەگونجاند. یاخود قاچەکانی دەبڕینەوە ، یان ڕایدەکێشان تاکو لەگەڵ ئەندازەی پێخەفەکەیدا هاودرێژیی دەبوون. وەرگێڕ

پەکخستن و ئیفلیجکاریش زۆر بە باشی بەرەو پێشەوە دەچێت. لە ئیسپانیادا هەواداران ولایەنگرانی رژێم تفەنگەکان بە پەیکەری مەسیحەوە دەنێن و تەقەی لێدەکەن، ئەگەر تۆ یاخیگەرو گەردنکەشێکیش بێت، ئەوا یاخیگەرو سەرکێشەکان گوللە بە منداڵ و ساوایانەوە دەنێن(ئەئاوایە ئیدی) بۆتۆ، ئەگەر هەوادارو لایەنگری رژێم بێت. ئێستاکە ئیدی فشارو گوشار خێراتر دەبێت. ئەم حاڵوبارەشدا هەندێ نووسەر لە پرۆسەکەوە دەگلێن، لە کۆمەك کردنی کاریگەرانەی پرۆسەکەدا دەکەونە نووسین و کاتێکیش کە هەموو شتێك کۆتایی پێ دێت ئەوسا ئیتر بە گێژو ویژییەوە بۆ هۆش و ئاگایی دەگەرێنەوە... بەلاّم ئەوانی تر لە رۆخدا دەوەستن و لە هاوار هەڵلاّ باستانییەکەی خۆیان بەردەوام دەبن. تێبکۆشن بۆئەوەی لەیەکتری حاڵیبن. چونکە هەرگیز ناتوانن رقتان لە پیاوانێك بێت ئەگەر بە باشی بیانناسن. هەموو ئەمانەیش دواتر سەرکوت دەکرێن. ئا ئەمەیش ئەو پێشنیارە نییە کە ئیتر ئێوە لە دواهەمین رەوتگیری خۆتاندا پەیرەوی بکەن. ئێوە پەیرەوی ئەوە دەکەن، چونکە ئەوە پیشەتانە و ژیانیشتان لە بارەی ئا ئەوەوەیە.

لە رۆمانی " مشك و بنیادەم " شتاینبێك بێ چەندو چوون " لە رۆخدا دەوەستێ" و تارادەیەك هەژموونی هونەریی خۆی بەوە وەدی دەهێنێت کە چیرۆکەکەی خۆی لە پشێوی و ناشووبی سالاّنی ۱۹۳۰ یەکانی کرێکاران دادەبرێ و سەردەمێکی کەم شپرزە ترو کەم وورووژاو تر بەرجەستە دەکات کاتێك کە لانەوازە و بێدەرەتانەکان بە گشت لاو ئاقارێکی هەرتمەکەدا لە گەران و سووراندا بوون، کاتێك کە ئیش و کار لە کێڵگە بەرفراوانەکانی دانەوێڵە و باخ و بێستانەکاندا زۆرو زەبەند بوون. هەرتەنها لەوەدا کە شتاینبێك بە "شێوازێك بۆ گەمارۆدانێکی شموولی" و "دیواری پاشخان" ناودێری کردووە تێکست سەدای چرکە ساتێکی مێژوویی بەرهەم دەهێنێت. هەر لە سالاّنی ۱۸۷۰ کانەوە تاوەکو دەوروبەری ساڵی ۱۹۳۰، بەروبوومی

دانەوێڵــە و میوەجــاتی ناوچـــەیەکی گـــەورەی کالیفۆرنیـــا لەلایـــەن کارگـــەرە گەڕۆکەکانــەوە درەو دەکــران و دەچــنرانەوە، کــە زۆربــەیان ئــەو پیاوگەلــە ڕەبەنانــە بــوون کــە گــەڕان و ســووڕان ببــووە نــەریت و خوویــان. هەنــدێکیان پــەتووی بــچووکی لوولخــواردو و یــاخود کۆڵەپــشتیان بــە کۆڵــەوە بــوو، هەندێکیــشیان بــەبێ هــیچ شتێك کە بیانپارێزێ هەر لەنێو درەختستانەکانی قەراخ جادەکاندا دەخەوتن.

دەســتمەزدەکان ناچــیزەو کــەمبوون، جێــسەقامەکانی ژیــان پــیس و پۆخــڵ بــوون، هــەلی گــۆڕان و بــەرەو پــێش چــوونیش لــە راســتیدا هــیچ بــوونێکی نــەبوو. هــەتا بــە ئیرادەتــرین و تــەمووحترین کرێکــار ئاســاییانەو هاکەزاییانــە لەگــەڵ نووچـــدان و ســـەرنەکەوتندا ڕووبـــەروو بـــووەوە و لەتاوانـــدا کەوتـــە گـــەڕان و ڕەوکــردن. توێژینەوەیــەکیش بــەو دەرەنجامــە گەیــشت کــە لەســەدا بیــست و پێنجــی کارگــەران توانــای ئــەقڵییان ســست بــوو بۆیــە ناچــار بــوون بکەونــە ســەر ڕێگــاو بانــەکان. بـــوونیش بــە کارمەنــدی مــەزرا واتــە بــوون لــەنێوان ڕەش و ڕوتــانی کالیفۆرنیـــادا، یـــانی برایەتییـــەکی بێدەســـتەلاتانە و ســـووك و ڕیـــسوایانەو دەســتمەزد ناچــیزانە. لێکۆڵــەر فرێــدرێك. ئــێس. میللــز لــە یاداشــتنامەیەکدا تێبینــی ئــەوەی کــردووە کــە لەســەرەتاکانی ســەدەی بیــستەم نووســیووێتی و تیایــدا دەڵێــت: " ئەمــە تاســەو ئارەزوویــەکی بەردەوامــە بــۆ هــاودەمێتیی مــرۆڤ، بــۆ پەیــداکردنی بــرادەر، کــە ئەمـــەیش لەمابـــەیی چـــینی چەوســـاوەدا، لـــەمیانی هاوســـەرە بێبــەریی کــراو و دەرکراوەکانــدا، یــاخود لــەمیانیماڵباتەکانــدا، یــان لــەمیانی هاوســەرە بێبــەری کــراوو دەرکراوەکانــدا، یــاخود لــەمیانی ماڵباتەکانــدا، یــان لــەمیانی دەســتەی بــرادەرە هاوســۆزو لایەنگرەکانــدا، شــتێکی فــرە بــەهێزە و ئـــەم درك و هەســـت پێکردنـــەیش تـــا ڕادەیـــەك هـــەر بـــەهۆی دامـــەزراوەی "هاوبەشــەکان"ەوە دەتــوانێ قــایلبوون دەســتەبەر بکــات. زۆربـــەی هـــەرە زۆری پیــاوانیش ڕقیــان لەوەیــە کــە تــاق و تــەنیا بــە ڕێگاکانــدا هامۆشــۆبکەن." بــوونی جوداکــەوتوو و بێــڕەگ و ڕیــشەی پەرتــەوازەو بێدەرەتانــەکانیش ئــەو مێژووەیــە کــە شتاینبێك بەدیاری دەخات.

بێگومـان ئـەو بـەو تەنیاییـەی کارگـەرە هـەژارەکان ئاشـنا بـوو. لـە دایکبـوو لـە سـالیناس، لـە کالیفۆرنیـا، لـە سـاڵی ۱۹۰۲ دا، شـتاینبێك لەیـەکێك لـە دەوڵەمەنـدترینی دۆڵـە کـشتوکاڵییەکانی کالیفۆرنیـادا گـەورە بـوو، کەتیایـدا خـاس و چـەوەنەری شـەکرو برۆکـۆڵی و چـەلیك بـە زۆرو زەوەنـدیی وەبـەر دەهێنـران و (هـەتاکو حـاڵی حـازریش هـەر وەبـەردەهێنرێن). کـە لـە قوتابخانـەی دواناوەنـدی و کۆلێـژدا بـوو لـەنێو کێڵگەکانـدا کـاری دەکـردو ڕووەك و بەروبوومـەکانی دەخـستە پاکەتـەوە، گـوێی لـە حیکایـەتی کرێکـاران رادەگـرت و قـسەو گوتـەکانی دەقۆزتنـەوە. بـۆ نزیکـەی دوو سـاڵی سـەرەتای سـاڵانی ۱۹۲۰ کـان و ئینجـا پـاش وازهێنـانی لـە زانکـۆی سـتانفۆرد، بـە دۆڵـەکانی کالیفۆرنیـادا کەوتـە گەشـت و گـەڕان و لـەو مەزرایانـەدا کـاری پەیـداکرد کـە مـوڵکی "سـپرێکلس شـوگەر" بـوون، سـپرێکلس شـوگەریش ئـەو کارخانەیـە بـوو کـە زەوی و زارێکـی بێحـەد و بێ پایـانی لەسـەر نەبـەری دۆڵـی سالیناسـدا کـۆنترۆڵ دەکـرد. چـەندین کرێکـاری کارگـەی سپرێکلـسی وەکـو جـۆرج و لێنـی، بـۆ هاریکـاری کـردن لـە دروێنـە کـردن و چـنینەوەی هـەردوو بـەروبوومی دانەوێڵـە و چـەوەنەری شـەکریش لەمەزرایەکـەوە بـۆ مـەزارێکی تـر دەنێـردران (هـەروەها، چـەندینی وەکـو جـۆرج ولێنـی، لـە ناژانـسەکانی ئیـشوکار پەیـداکردنی هاوشـێوەی مـۆرەیی ئانـد ڕێـدیی سانفرانسیـسکۆدا سـۆراغی کاریـان دەکـرد.) بێگومـان، ئـەو ڕووداوەی کـە ئیلهامبەخـشی ڕۆمـانی " مـشك و بنیـادەم " بـوو لەوانەیـە لەیـەکێك لـەو مەزرایانـەدا ڕووی دابێـت. شـتاینبێك کـە خۆیـشی لەسـەرەتای سـالانی ۱۹۲۰ کانـدا وەکـو کـۆڵ کـێش کـاری دەکـرد، پیـاوێکی شـەرزەو گێروگرفتـاویی بێـرادە زلحۆرتی بینـی بـوو کـە سـەرکاری مەزرایـەکی کوشـت بـوو، لـە سـاڵی ۱۹۳۷یـشدا بـە پـەیامنێرێکی نیویـۆرك تـایمزی گـوت: " لێنـی کەسـێکی ڕاسـتەقینە بـوو، تـا ئەمـڕۆش نیـشتەجێی تیمارخانەیـەکی شـێتییە لـە کالیفۆرنیـادا. مـن خـۆم بـۆ چـەندین هەفتـە لەگەڵیـدا ئیـشم کـرد. لێنـی هـیچ کـچێکی نەکوشـت، بـەڵکو ئـەو

بـــەرکاری مەزرایـــەکی کوشـــت. لەبەرئـــەوە پەســـت و شـــێتگیر بـــوو چـــونکە ســـەرکارەکە ئاواڵەکـەی ئـەوی لـەکاردەرکرد و بۆیـە ئـەویش ڕێـك شـەنەیەکی بـە ورگیـدا ڕاکـرد و کوشـتی. دڵـم نایـەت ئـەوەت پـێ بڵـێم کـە چـەند کـبەڕەت شـەنەکەی بـە ورگیـدا کـرد. مـن خـۆم بینـیم کـە ئـەوەی کـرد. ئێمـە نـەمانتوانی ڕێـی لێبگـرین هـەتا ئـەو کاتـەی کـە ئـیتر کـار لـە کـار ترازابـوو." ئەمـە لـەو چەشنە ڕووداوانـە بـوو کـە شـتاینبێك بـۆ ئـەوەی دواتـر بـەکاری بهێنـێ هـەڵیگرت و پاراســتی، چــونکە ڕووداوێکــی زینــدووی ئــەوتۆ بــوو کــە خــاوەنی دەلالــەت و هێماگەلێکی بەمەوداو پانوپۆڕ بوو.

لەمیانـەی ئـەو دەرزەنـە ساڵەی شـاگردێتییەکەی و سـالآنی کۆلێژییـەوە هـەتا ســالآنی ناوەڕاســتی ســییەکانی تەمــەنی خــۆی ئــەو ڕووداوانــەی تۆمــار کــردو هـەڵیگرتن. ئـەو کاتـەی کـە هەمیـشە بـژێوی بـە نووسـین چـنگ دەکـەوت، نووسین لــەبارەی کالیفۆرنیاییــەکان و زەوی و زارەکانیانــەوە. لــەبارەی خــەونی ماڵوحــاڵی زامـــن و بەختـــەوەرەوە لـــە ڕۆژئـــاوای بەهەشـــت ناســـای ئـــەو خەڵکـــە ســـاکارو عەوامەی کە هەردەم نوغرۆوداغان دەبوو.

وێـــڕای ئـــەوەیش کـــە لـــە ســـەرەتای ســـالآنی ١٩٣٠ یەکانـــدا ســـێ ڕۆمـــانی بلآوکـــردەوە- کـــووپی زێـــڕین (١٩٢٩)، بـــۆ خودایـــەکی نەناســـراو (١٩٣٣)و، پاوانـــەکانی بەهەشـــت (١٩٣٢)- و باشـــترین کورتـــە چـــیرۆکەکانی خۆیـــشی نووسـیی، بـەلآم یەکـەمین سـەرکەوتنی دارایـی و سـامان دەسـتەبەرکردنی خـۆی لـە سـاڵی ١٩٣٥دا بـە ڕۆمـانی تۆرتێیـا فـلات" بەدەسـت هێنـا. بـەم شـێوەیە، بـەهۆی کۆمەڵـە حیکایـەتێکی نائاسـاییەوە کـە لـە بـارەی پـەیزانۆکانی (جوتیارەکـانی) مۆنتێرییـــەوە بـــوو کـــە پیـــشەیەکی ســـەرکەوتوو بـــۆ ئـــەو دەســـتی پێکـــرد، حیکایەتـــەکانیش بەشـــێوە گوزارشـــتێك گێڕدرانـــەوە کـــە لاســـایی شـــێوازە ئیـسپانییە خۆڕسـکەکەی خۆیانیـان دەکـردەوە. ئەوسـا تەمـەنی سـی و سـێ سـالآن بـوو. بـۆ دوا پێـنج سـاڵی ڕابـردووی ژیـانی، خـۆی و کـارۆڵی ژنـی بەهرەمەنـدو

لێهاتووی، لە خانووی هاوینەی خانەوادەکەی شتاینبێك لە پاسیڤیك گرۆڤ دا ژیابوون، کە جڤاتێکی کەنار دەریایی هاوسنووری مۆنتێریی بوو. لەنیوەی یەکەمی (دەیەساڵ)ە کەدا، کارۆل پچڕ پچڕ و ناوبەناو کاری دەکرد و جۆنیش دەینووسی و هەردووکیان بە کولەمەرگی بەو دەستمەزدە نەگونجاو و نارێکوپێك و بیست و پێنج دۆلارە هەڵیان دەکرد کە دایبابە پشتیوانکەرەکانی جۆن مانگانە بۆیان فەراهەم دەکردن. بەڵام بەو چوار هەزار دۆلارەی کە بۆ مافی بە فلیم کردنی ڕۆمانی "تۆرتێیا فلات" پێیدرا، شتاینبێکەکان بۆ یەکەمین جاربوو هەستیان بەوەکرد کە لە نیگەرانییەکانی دارایی ڕەخسیوون. لەگەڵ دەست پێکردنی ساڵی ١٩٣٥ بۆ مەکسیکۆ سەفەریان کرد، مەکسیکۆ ئەو وڵاتەی کە هەردووکیان بەتاسەی ئەوەوە بوون بیبینن. چەند مانگێك پاش ئەوە، بە پڕفرۆشیی ڕۆمانی " لەشەڕێکی گومانئامێزدا"، کارۆڵ نەخشەی بۆ یەکەمین خانووی خۆیان کێشا، کە لە لۆس گاتۆس دا بینا بکرێت، کە گوندێك بوو شەست میل دوور، لەنێو دۆڵی سانتاکلارای بەسەوزایی داپۆشراودا جێگیربوو. بەمشێوەیە ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" یەکەمین کتێب بوو کە شتاینبێك بەهەستێکی هونەرییانەی جودا و سەربەخۆی ئەوەوە دەستی بە نووسینی کرد کە زادەی متمانەیەکی تایبەتی و شەخسیی بوو. لەدوادوای ساڵی ١٩٣٥ یشدا شتاینبێك بۆ ئێلیزابێت ئۆتیسی ئاژانسی ئەدەبی خۆی نووسی و دەڵێت: " لەوانەیە بەم متمانەو زامنییەوە بتوانم کتێبێکی باشتر بنووسم. لەوانەشە نەتوانم. بەڵام بەدڵنیاییەوە پێم دەکرێ ماوەیەکی نەختێك درێژخایەن تر خۆمی پێوە سەرقاڵ بکەم و کتێبێکی وردە کارانەتر و هۆشمەندانە تر بنووسم."

بەڵام بەهەر مەبەستێك بووبێت، کتێبەکە، کە لە خانوویەکی بچکۆلانەی پاسیفێك گرۆڤ دا دەستی پێکردو لەنێو بەنگەلۆیەکی تازەی لۆس گاتۆس دا کۆتایی پێهات لە حاڵوبارێکی ئاسوودە و ئارامدا نەنووسرا. (لە ڕاستیشدا،

هەر چەند دانەیەك لە كارەكانی شتاینبێك لە كەش و هەوایەكی نارامدا نووسرابوون). هەتا كاتێكیش كە زۆر بە باشی بەنێو دەستنووسەكەدا قووڵ ببووەوە، كەچی هەر بڕوا بە خۆ بوونی لەرزۆك و شڵەقاو بوو. هەر زوویش پاش باركردنیان بۆ خانووە تازەكەیان، لە یاداشتنامەكەیدا نووسی: " ڕۆمانەكە، برێك كێشەی ئەوتۆی تێدا هەیە كە چارەسەركردنیان ئەستەم دژوارە، بەلاّم گەورەترین كێشە كێشەی چارەسەركردنی مەیل و ئیرادەیە. یاداشتی كاركردنیش بۆمن گەلێك قێزە وونە، چونكە بەبێ مەیلییەكی زۆر بێهاوتاوە كاردەكەم. هزرو ئیرادەیش پێویستە سەر لە نوێ كۆنسێنترەیەكی مەحكەم و بەجێ بكات." كە ئەمەیش دانپیانانێكی دڵداخورپێنە كە لە لایەن نووسەرێكی سەركەوتووەوە خرابێتە ڕوو، هەروەكو جاكسۆن بێنسۆنی ژیاننامەنووسی سەرپشك كراوی شتاینبێك یاداشتی كردووە. هەتا كاتێكیش كە لە ڕووی داراییەوە باری مسۆگەرو پارێزراو بوو، شتاینبێك لەبارەی ئەو جۆرە ناوچەیەوە دەستی بە نووسین كرد كە دەكەوێتە سەر ئاستانەی هەست و هۆشەوە:

لەسەرێكەوە لە هونەرەكەی خۆی دڵنیاو لە دەربڕینی خۆیشی خاترجەم بوو، بەلاّم لەسەرێكی دیكەوە لە تواناكانی خۆی بەدگومان و ڕاڕا بوو، لەگەڵ ئیرادەیەكی خاوخلیچكیشدا پێوریتانیانە خەریكی ململانێ كردن بوو. پەیدەرپەی لەو یاداشتانەی كە لە كاتی نوسینی ڕۆمانەكانیدا دەینووسین، دڕدۆنگییەكانی خۆی تۆمار دەكردو گومان كردنی لە تواناكانی خۆی كەمدەكردەوە، لە خودی پرۆسەی نووسینی وشە سرووشدارەكانیشدا وا دەردەكەوێت كە: " چۆنێتی بەردەوام بوونی ئەمە شتێكی سەیرو سەمەرەیە. هەوڵ و كۆششی دەست پێكردنیش، شتێكی سامناكە. بەداخەوە... ئەمە هەمیشە ڕوودەدات. لەنێو شتەكانی تریشدا هەست بەوە دەكەم كە فرتوفێڵم كردووەو ئەو سەركەوتنە بچكۆڵەیەیشم سەركەوتنێكی ساختەیە. هەست بەوەش ناكەم كە هیچ بەشێكی لێ باش بێت. هەر هەمووی ساختەیە."

ئینجا پاش ئەم برگەجیاکارەیش، دەچێتە سەردەقی "مشك و بنیادەم" و ئەو ئیرادە گۆڕەکە ڕێکدەخات و ناڕاستەی دەکات و دەڵێت: " هەموو شتێك دەتوانم ئەنجام بدەم ئەگەر ئیرادەم پاك و بێگەردو ڕاستەقینە بێت. هەموو شتێك دەتوانم ئەنجام بدەم." لەبەر ئەوەیش کە جۆن شتاینبێك وەکو خوێندکارێکی قوتابخانەی ئامادەیی پەیگیر بوو لەسەر ئەوەی کە ببێتە نووسەرو یەکەمین کتێبیشی دوای نزیکەی پازدە ساڵ ئینجا بڵاوکردەوە، نووسین بۆ ئەو مەسەلەی دیسیپلین بوو، مەسەلەی دانان و وەدی هێنانی کۆڵنەدەرانەی کۆمەڵە ئارمانێك بوو. ئەو پەخشان و نووسینەیشی کە سووك و ئاسان و زۆر ڕوون و ئاشکرا و ڕاستەوخۆ و هەست و سۆز بزوێن بەدیاردەکەوت، لە ڕێی فێربوون و ڕاهاتنی چەندین ساڵە و ئیشکردنی گەلێك سەخت و دژواری چەندین مانگەوە خرابووە ژێر ڕکێفەوە. ئەگەرچی نووسین خولیاو عەشق و گوزەرانی شتاینبێك بوو، بەلام سەربار گانگەشەوململانێیەکی بەردەوامیش بوو. بێگومان هەوڵ و تەقەللا پرۆمیسیۆسانەکانی ئەو بۆ دەست پێکردنی هەردەقێك دەشێ چەشنی وانەیەکی ئامانجدار بۆ ئەوانە سوودمەند بێت کە دەیانەوێ ببن بە نووسەر. پەخشانی ناوازەو ڕێکو ڕەوان و مشتومالّ کراوی ناو ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" بەدەست وبردو پەلە نووسراوە، تامو چێژێکی نایابیش خراوەتە نێو هونەرکارییەکەیەوە و هەروەها چەند ڕەشکردنەوە یاخود چەند گۆڕانکارییەك لە دەستنووسەکە دا کراوە (کە هەر تەنها بەشێکی فرە کەمی لێ ماوەتەوە). بەلام شتاینبێك لەگەڵ دەستەبەرکردنی دانپیانان و پێزانینی خەلکیشدا، هێشتایش هەر بە گومانێکی زۆر ئەشکەنجە ئامێزەوە لەبارەی داهێنەریی و خەللاقیەتی خودی خۆیەوە دەینووسی.

ئەی کەواتە بۆچی ئەم ڕۆمانە قەبارە بچکۆڵە و فشەردەو لە ڕابردوو - ڕامێنەرەی لەنێو بۆتەی مەزنترین تەنگژەی ئابووریدا نووسی ؟ من لەو

باوەڕەدام کە پا سڤی ئەم پرسیارە دوو بەش بێت – یەکێکیان شێوەیەو ئەوی تریشیان بابەتییە. شتاینبێك بەدرێژایی کارو پیشەی نووسەریی خۆی هەر کتێبێکی وەکو ئەزموونێکی جیاواز، وەکو هەلێك بۆ پەنابردنە بەر بابەتێکی تازە یاخود تاقیکردنەوەی کارامەیی خۆی لە شێوە و فۆرمێکی تازەدا، تەماشا دەکرد: چونکە ئەو لە رۆمانی "مشك و بنیادەم" دا ژانری تایبەتمەندی خۆی نەفراند، کە ئەویش ژانری شانۆنامە / نۆڤلێتە. شتاینبێك لە مانگی نیسانی سالّی ١٩٣٦ دا نامەی بۆ ئاژانسە ئەدەبییەکانی خۆی نووسی و تیایدا دەلّێت: " ئەو کارەی کە من ئێستاکە مژوولّیم، نە رۆمانە و نەشانۆنامەشە، بەلّکو جۆرە رۆمانێکی شانۆنامێزە. نەگەرچی لە شێوەی رۆمان نووسراوە، بەلاّم هێندە دیمەندارو ئامادەکراوە کە دەکرێ رێك وەکو خۆی بەبێ دەستکاری کردن سەر شانۆ بخرێت. وەکو هیچ یەکێ لە شانۆنامەکانی تریش نییە چونکە پەیڕەوی پەردە سوننەتییەکان ناکات، بەلّکو لە جیاتی پەردەکان بەش بەکاردەهێنێ. هەروەها دەکرێ وەسفەکانیش لە رێنماییەکانی سەرشانۆدا بەکاربهێنرێت... لەبەرنەوەیش کە خوێندنەوەی شانۆنامە سەخت و دژوارە بۆیە ئەم تێکستە هەروەکو خۆی، هەردوو ژانری رۆمان و شانۆنامەیش پێك دەهێنێت." شتاینبێك لە ناخرو ئۆخری سالآنی ١٩٣٠یەکان و سالآنی ١٩٤٠کاندا پێش پۆست مۆدێرنیستەکان کەوت و بە پێداگرییەکی زیاترو مەزنترەوە ئەوەی راگەیاند کە رۆمان مردووە، بەلاّم شانۆ کە خەریکی "بێدار بوونەوە" بوو، شتێکی تازەو گانگەشە ئامێزبوو. بەمشێوەیە رۆمانی "مشك و بنیادەم" لەسەر ترۆپکی دوو ژانردا لەنگەری گرت، کە یەکێکیان مردبوو، ئەوی دیکەیشیان زیندوو بوو. لەوانەشە مەبەستەکانی شتاینبێك پێبەپێی بوونی ئەم خالّە لە هزردا، بەشێوەیەکی باشتر نرخێندرابن. ئەم شانۆنامە/ نۆڤلێتە، سروودی جەماوەرییانەی شتاینبێکە، ئەو تێکستە دوو ڕەگ و ناوێتەیەیە کە هاوکات دەستەبژێرێك و

جەماوەرێکی خۆشەویست پێکرا لە ئامێز دەنێت، ڕەنگە ئەمیش وەکو دیوانە شیعری "چڵەکانی گیا" ی والت ویتمان ژانرێکی تەواو ئەمەریکی بێت. ئەو پێیوابوو کە کارەکە زیاتر وەکو ڕۆمانێك نەك وەکو درامایەك، شیاوترو درك پێکراو ترەو بۆ خوێندنەوەش ئاسانترە. بێجگە لەوەش، هەروەکو خۆی لە وتارێکدا کە ساڵی ١٩٣٨ بۆ گۆڤاری "ستەیج" نووسیویتی تێبینی ئەوەی کردووە کە فۆرمی ڕۆمانە کە بواری چارەسەرکردنێکی شارەزایانەی کاراکتەرو برگە وەسفییە ناسك و کارامەکانی داوەو واژۆی چاکترین ڕۆمانیشێتی. هەروەها ڕۆمانەکە ڕێگای بۆ شێوازێکی دەوڵەمەندتر خۆشکرد، کە بۆ شتاینبێك شتێکی "زۆر بەبایەخ" بوو، "تێگەیشتنێکی سەرانسەریی زۆر کاملتر بوو" لەوەی کە لە نێو درامادا شیاوو مومکین بێت. لە سەرێکی تریشەوە، " لە شانۆنامەدا، نووسینی لاوازو خراپ ناپەسەندو نەشیاوە." شانۆنامەیەك بۆ جەماوەری ساڵانی ١٩٣٠ یەکان دەرخواستی تەرکیزکردنێکی قایم و مەحکەمی دەکرد- چونکە سەردەمە ناهەموارەکانیش — هەروەکو خۆی لە دەستپێکی یاداشتێکدا کە بەر لە یەکەمین هەوڵی خۆی بۆ شانۆنامە نووسین، نووسیویتی و ئەو هەوڵ و پارچە نووسینە بلاونەکراوانەیش کە بەناوی "جادوباز" ەوەیەو لە ساڵی ١٩٣٢دا دەستنووسەکەی نووسراوە، دەڵێت: " ئێستاکە ئێمە لەناو قەیرانێکی ئابووریدایین. بۆیە شانۆنامەکەی من هەرتەنها دوو کاراکتەری سەرەکی و دوو کاراکتەری لاوەکی و دوو کاراکتەری یەدەکی دەبێت. " بێگومان ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" یش دەق بەو جۆرە چڕوپڕو پوخت کراوەتەوە. بۆ ئەوەیش کە بۆ شانۆ بنووسێت دەبوو زۆر هەستەوەرانە لە جەماوەر بە ئاگابێت، لەپەرچەکرداری هەست و سۆزیان بەرامبەر بە شانۆ بە ئاگابێت و لە ئەزموونی ئەو هەست پێکردنەیش بە ئاگابێت کە چۆن کەمەندکێشی کردووەتە نێو ئەو گرووپەی کە شانۆگەرییەکە دەنوێنێ" بەم چەشنە ژانرە

تازەکەی شتاینبێك بواری ئەوەی بۆ ڕەخساند کە نە هەمان کاتدا ئەو وردە تەفاسیلانەی دەربڕین بدۆزێتەوە کە لە لایەن جەماوەرێکی خوێنەرەوە بایەخی پێدرابوو هەروەها وێنەی سەرگوروشتەیەکی ئێجگار بە جۆش و خرۆشیش بۆ بینەرانی شانۆ بکێشیّ. ئەو پێیدەکرا نەیەك کاتدا هونەرمەندێکی سیمبۆڵی و پیشەگەرێکی بەزەبتوڕەپتیش بێت، دەیتوانی هاوکات نووسەری ڕۆشنبیرە بەرزەکان و کۆمەڵانی خەڵکی سادەو ئاساییش بێت. ڕۆمانی شانۆ ئامێز- ئەو فۆرمە بوو کە لە دەساڵی دواتری دا زۆرجار شتاینبێك دەگەڕێتەوە سەری (بۆ نموونە لە ڕۆمانە نابەکامەکانی "خوای نێو پاپەکان"، "مانگی ئاوابوو"، "سوتانێکی درەوشەدار") — کە بۆ برادەرێکی نووسیبووی و دەڵێت، " بۆ بیرۆکەی سەرەکی ڕۆمانەکە ئامرازێکی پڕ بە پێست بوو"، ژانرێکی نموونەییش بوو بۆ ئەو نووسەرەی کە بۆماوەیەکی درێژخایەن لە سۆراخی شێوەو ڕووکارێکی چڕوپڕو مانایەکی قووڵدا بوو، ئەو نووسەرەی کە پەخشانێکی ڕێکوپێك و ڕوون و ئاشکرای ئەوتۆی نووسی کە نەسەر چەند "ئاستێك " دا مانای بەرهەم دەهێنایەوە، هەروەکو خۆیشی سەرومڕ لە کتێبەکانیدا تێبینی ئەوەی دەکرد.

ئەگەر ئارەزووی ئەزموون کردنی فۆرم پاش ڕۆمانی "نەشەڕێکی گومانئامێزدا" شتاینبێکی بە ئاڕاستەیەکی تازەدا بردبێ، ئەوا لە وانەیە ئارەزووی داڕشتنەوەی بابەتی ئەو ڕۆمانە دووروودرێژە هاندەرێکی تر بووبێ. دڵەڕاوکێی کارتێکردنیش، بۆ شتاینبێك مانای ململانێ کردنی دەبەخشی، نەك لەگەڵ داهێنانی نووسەرانی دیکەدا، بەڵکو لەگەڵ بەرهەم و داهێنانەکانی خۆیدا، ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" ڕۆمانێکی مەحکەم و فشەردەیەو لەبنچینەدا بەرپەرچدانەوەو پاشقێکی زۆر تایبەتمەندە بۆ بێدەسەڵاتیی چینی کرێکاری کالیفۆرنیا، هەروەها ئەو جۆرە لێکۆڵینەوە ڕوون و ئاشکرایانەش دەچێت کە زۆرجار پاش تەواوکردنی کتێبە قەبەو دوورو

درێــژەکانی دەینووســین، وەك بلێیــت پێداویــستیی بــە هەڵــسەنگاندن بوویێــت، پێداویــستیی بــە هێــوور بوونــەوە بوویێــت، بــۆ ئــەوەی لــە نزیکــەوە بــە وردی شــتەکان ببینێــت. ئــەو کاتێــك کــە ڕۆمانەکــەی دادەڕشــت، ئــەوەی بــە " بــێن ئەبرامــسۆن" ی بازرگــانی کتێــب وت کــە تێکــستەکە "قورســایی ڕۆمــانی " لەشــەڕێکی گومانئــامێزدا" ی نییــە ومەبەشتیــشی نــەبووە ئــەو قورســاییەی هــەبێت. ئەمــە جــۆرە شــتێکی تــەواو جیــاوازە." و ئەمــەیش گوزارشــتێکی فــرە دانــسقەو تایبەتمەنــدە. ســەرجەمی بەرهەمــەکانی شــتاینبێکیش پێگەیــەکی ناوازەیــان هەیــە، چــونکە ئــەو بێووچــان ســەرقاڵی تاقیکردنــەوەی ژانــرو بابــەت و تەکنیکــەکانی نووســین بــوو. ئــا بەمــشێوەیە، کاتێــك کــە ڕۆمــانی خــەبات و کێــشمەکێش لێتۆژینەوەیــەکی تــەواو ســازو گونجــاوی ئــەو کارگەرانــە بــوو کــە لەلایــەن ئــەو کۆمۆنیــستانەی کــە ڕێکیــان دەخــستن و ئــەو مــەزرا گەڕانەیــشەوە، فێــڵ و گزییــان لێدەکرا کــە ئیــستیغلالیان دەکــردن. ڕۆمــانی "مــشك و بنیــادەم" تۆمارنامــەی زینــدەگی قــووڵ و تایبەتمەنــدی ئــەو کارگەرانەیــە کــە بــە شــێوەیەکی گــشتی ئــەو قوربانییــە نەناســراوو بێناوانــەی نێــو کتێبــی پێــشوترن. ئــەم ڕۆمانــە، هــەروەکو دوانــەوی ئــەو دوو قەلەنــدەرە هــەژارە (میلتــۆن/ سمــۆڵ) ڕیــشخەند ئامێزانــە ئامــاژەی پێــدەدەن، بەرپەرچــدانەوەو وەلامــی جیهــانێکی بــچووك کراوەیــە بــۆ داســتانی "لەشــەڕێکی گومانئــامێزدا"، ئــەو پیاهەڵپژانــە سۆســیۆ- رامیارییــە چارەســەرنەکراوانەی ناوتێکــستی پێــشوتر بەرچــاو دەخــات، بــەلام هەڵبەتــە متووربــەکراو بەســەر گوزەشــتەیەکی قــووڵ و ناخانــە لــەبارەی زویــری و دڵــشکانی ســایکۆلۆژییانەی چــینی پــەراوێزخراوەوە، بــۆ ئــەوەیش کــە بــە تــەواوەتی ناریــشە و گرفتــی کرێکارەکــان بکاتــە ئامــانج، شــتاینبێك ســەرلەنوێ ئــەو دیمەنــەی نووســییەوە کــە خــۆی بــەر لــە دە ســاڵ شــایەدحاڵی ببــوو. ئــەوەی کــە بینیبــووی پێکــدادان بــوو لــەمیانی کرێکــارێکی ڕەوان پەشــێو و ناتــەواوو ســەرکارەکەی دا، پێکــدادان بــوو لــەمیانی بێدەســەلات و نیلیتــی دەســەلاتداردا. ئــەوەیش کــە بــوو بــە

چڵەپۆپەی ڕۆمانەکەی شتاینبێك بەرەنگاربوونەوەی نێوان دوو کەسی لەماف بێ بەری و بەشخوراو بوو- لێنی و ژنە تاق و تەنیاو بێکەسەکەی کێرلی — ئەو کێبەرکێیەی کە ماناکەی کەمتر بەهۆی چەوسانەوەو ململانێی چینایەتییەوە پابەندبوو وەك لەوەی بەخودی مانا و مەبەستی ئەو چەوسانەوەیەوە پابەندبێت. ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" (پۆرتریتی سەر سەدەفی) نوێنەرێکی نموونەیی و بالآی قەڵەمڕەوی چینی کرێکارە، ئەو قەڵەمڕەوەی کە بێدەسەلآتیی خودی کرێکاران تیایدا پشێویی و ناڕەحەتیی کۆمەلآیەتیی بەرهەم دەهێنێت. ئەو جیهانەشە کە بەهۆی کۆنترۆڵ کردنێکی بچکۆلەو بەدحاڵیبوون و بەخیلی و دڵپیسی و دڵڕەقییەوە کارێکی شەخسیی و تایبەتی تیادا دیاریکراوە. ئەو واقیعە — سیاسییەی کە شتاینبێك لە ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" دا ئازمایشی کردووە، "چەند میلێك لە خوارووی سۆڵیداد" دا ڕووی داوە — سۆڵیداد، کە وشەیەکی ئیسپانیاییە و مانای تەنیایی و دووره پەرێزی دەگەیەنێ — ئەو تەنیایی و تووڕەییە توندوتیژەیە کە بێئومێدی هێناویەتییە ئاراوە.

هەڵبەتا، شتاینبێك بەدرێژایی ڕۆمانەکە پەیدەرپەی ململانێی نێوان نوخبەی دەسەلآتدارو بێدەسەلآتان دەچەپێنێ، کە ئەم ململانێیەیش چەقی تێکیستی پێشوویەتی. نیشانەو هێماکانی دەسەلآتی سیاسی و کۆمەلآیەتیش لەسەرەتا و لە کۆتاییش دا، یان درێژە پێدانن، یانێخۆیش سەرکوتکردنی تووڕەیی کۆمیتەی تاقمی بەرقەرارکردنی ئاسایش و تووڕەیی و دەهری بوونی سەرکارەکە بەرامبەر بە دواکەوتن و لە کاتی خۆدا نەگەیشتنی لێنی و جۆرج و وردە وردە وروژانی بێزاریی و وەڕسیی کێرلین.

دیمەنی دەستپێك جەخت لەسەر ئەم دیاری کردنە دەکات، کاتێ کە شتاینبێك هەردوو کارکتەرە بێدەرەتان و بەلەنگازەکەی خۆی لەو دیمەنەدا بەدیاردەخات کە هەم نزیکییان دەگەیەنێ لە سروشتەوە و هەم بێبەریی

بوونیشیان دەگەیەنێ لە هەموو هێزو دەسەلاتێکی ڕاستەقینە. سەرەڕای ئەوەیش کە پەرەگرافی بێڕادە ورووژێنەری یەکەم، تێبینی ئەوە دەکات کە "شاخە سەخت و دژوارەکانی گابیلان" لەسەرووی ڕوتەنییەکەوە شەقڵ دەگرن- ئەو شاخانەی کە بە درێژایی بەشی یەکەم و بەشی کۆتایی ڕووناکی خۆرئاوابوون بۆ خۆیان کەمەندکێش دەکەن- چاومان وا لێدەکەن لەسەر ئەو شوێنەی قەراخی ڕووباری سالیناس دا سەقامگیر بێت کە تاریکایی دایدەگرێتەوە، چاومان وا لێدەکەن لەسەر ئەو گۆماوەدا چەقبەستێ کە ژیان بۆ ئانوساتێك سەرڕووی ناوەکەی دەکەوێت و دواجار دیسانەوە نوقمی قوولاییەکان دەبێت. ڕۆمانەکەیش وەکو چۆن ڕۆشنایی پەیتا پەیتا کزدەبێت و ژیان و چالاکیش هەڵدەلووشرێت، ئاوەها بەپێچ و لوول خواردنەوە دەچێتە نێو تاریکایی. بۆ چرکە ساتێك، بەر لەوەی جۆرج و لێنی بەنێو بێشەلانەکەدا ڕابوورن. شتاینبێك کردارەکە ڕادەگرێت و ئەم کۆنسێنترەیە لەسەر ئەو سپە یسە دیاری کراوەدا بە تین و تاوو چڕوپڕتر دەکاتەوە. بێدەنگییەکانی سەرانسەری دەقەکە — بە تایبەتیش پاش کوژرانی ژنەکەی کیرلی لەنێو تەویلەکەدا — خوێنەر لەنێو شوێنە دژوارەکاندا بەگیر دەهێنێ. ئەگەرچی هەندێك لە ڕەخنەگرەکان لەگەڵ ڤی. ئێف. کالڤێرتۆن دا "بونیادی دەستکردو ڕق هەڵسێنی گرێچنەکە" یان ڕەتکردەوە، بەلام زۆربەیان درکیان بەوە کرد کە بونیادی درامیی پەیجۆری چڕیی و فشەردەیی دیمەن و مانایەك دەکات کە دنیا دیاری دەکات . دیمەنە مەحکەم و پتەوەکانیش فریو خواردن و ناچاربوونی مرۆڤەکان دەردەخەن. ئەم لێکۆڵینەوە وردو سەخت و چەقبەستووە هەروەکو شتاینبێك خۆیشی دانی پیادا نا، "دژوارە" دەست گیرۆیی ئەوەی کرد کە ئەوە دەربخات کە کرێکارەکان نەك لە ڕێی ململانێی دەرەکییەوە خۆیان وێران و ئابوت دەکەن، بەڵکە لە ڕێی بێزاریی و وەڕسیی خودی خۆیانەوە خۆیان لەبەین دەبەن. ئەو پێچ و لوولخواردنە ڕوو لە خواردوەیەی کە گەلێك لە

ئاوارەوگەڕۆکەکان لە ژیانی خۆیاندا ئەنجامیان دا جارێکی تر بە خەیاڵ لەنێو پەرچەکرداری دژواری میان کاراکتەرە سەرەکییەکاندا خولقێنرایەوە.

کاتێکیش کە شتاینبێك لە دوادوای هاوینی ساڵی ١٩٣٦د ڕۆمانی "مشك و بنیادەم"ی بۆ ئاژانسە ئەدەبییەکانی خۆی ڕەوانەکرد، بە قەبارەو درێژییە سنووردارەکەی تووشی نائومێدی بوون. ئەویش لە وەڵامدا بۆی نووسین: " جێبداخە کە کتێبە تازەکەم نە ناوەڕۆك و بابەت دا هێندەی ئەو گەورەییەی کە دەبوایە ببێ بەدی ناکەن. لەوانەیە من بابەتەکانی خۆم و ڕەمزەکانی خۆمم ڕوون و ئاشکرا و بەباشی دەرنەخستبێ. مامەڵە کردن لەگەڵ جیهانی بچووك کراوە تا ڕادەیەك دژوارەو وا دیارە نەمتوانیووە بەرزەفتی بکەم — تاسەو پەرۆشییەکانی لێنیش بۆ خاك و زەوی و زار، ئەو لێنییەی کە بە هیچ شێوەیەك دەربڕو نوێنەری شێتیی نەبوو، بەڵکو دەربڕو نوێنەری تاسەو ئارەزووی بەتین و هێزو نەفامبەدەری هەموو پیاوێك بوو."

ئەگەر تێگەیشتن سنووداربێت، ئەوا هەنبەتا ماناکانیش سنووردارن، هەروەکو شتاینبێکیش دەرکی بەوە دەکرد کە نەمە شتێکی گشتگیرو شمولییە. چونکە بەرامبەر بە تەنیایی و نامۆیی هەر نەگونجان و کەموکورتییەك لەنێو ڕۆمانەکەدا — بەرامبەر بە: شەل و گۆجێك، پیاوێکی ڕەشپێست، ژنێك، جۆرجی چکۆلانەو گزگل و لێنی شێرئاسایش (کە یەکێکە نەوانەی کە خوا بە تەواونەکراویی بەجێی هێشتوون، هەروەکو شتاینبێك خۆیشی لە ڕۆمانی پاوانەکانی بەهەشت دا بە کەودەنییەکی ناوازە و خەنلاق وەسفی دەکات) — دۆستایەتی و خەونی لێنی و جۆرج هەیە. تایبەتمەندێتی و خەسڵەتی ئەو دۆستایەتییە شپرزە و سەرەڕای ئەوەیش بێباك و پڕ ئیرادەیەی کە بە دەستەواژەی ڕۆبەرت فرۆست " ئەو هەنوەستەو ناوبرە کورتخایەنەیە دژ بەسەر لێ شێوان و ئاشیفتەبوون" کە لە دنیایەکی دڕندەو بێبەزەییدا بوون مانادار دەکات، بێگومان نەگەر بوون ئەئاوا بە خێرایی ڕابووڕێت. پێوەندی نێوانیان

بە شێوەیەکی بەربلاوسیمبۆلییە، پۆتانسییەلّی مەجازیشیان، هەروەکو پیتەر لیسکا دەلّێت: " هەر تەنها بە هۆی کارامەیی جەماوەری (موتالاکەرەوە) دیاری کراوە."

بەهەر حالّ لەنێو رۆمانەکەدا، حالّیبوون لە وابەستەبوونی هاوسوودیی هەردوولا زۆر نەستەمە. ئەوی راستی بێت دوا دێرهینی کارلّسۆنە، ئەو پیاوەی کە خاوەنی دیدێکی نزیك بینیی ئەوتۆیە کە رەنگە نەتوانێ لەو نجیرە رووداوە تێبگات کە دەبێتە هۆی دەرچوون و رۆیشتنی دوابینی جۆرج و سلیم، کە دەلّێت: " دە بۆ خاتری خوا.. پێم بلّێ: ئا ئەمانە چییان لێ بەسەرهاتووە؟ " تەواو وەك کۆتایی رۆمانی "بیلی بەدد" - کە تا ئەندازەیەك بوونی ناوازەی بیلیی بۆ چەکامە و پەخشانی رۆژنامەوانی پەرچڤەکرابوو - نزیك بینیی کارلّسۆنیش هەر بەو شێوەیە پێویستە لەلایەن تێگەیشتن و حالّیبوونی خوێنەر خۆیەوە بەرکەمالّی پێ بدرێت." ئەو شتەی کە رووی دا" لەوەدا یەکالا نەکراوەتەوە کە دواتر کاراکتەرەکان چی ئەنجام دەدەن، یاخود لەو فرمانەدا یەکالا نەکراوەتەوە کە بەسەر ژیاندا سەپێنراوە، بەلّکو لە راستیدا لە درك پێکردن و تێگەیشتنی خوێنەر بۆ ئەو خواستە بەوەدی نەهاتن مەحکوومەی لێنی و جۆرج دا یەکالاکراوەتەوە.

ئەو خواستە، بە دۆستایەتی و خەونەکەیان شەقلّی گرتووە. ئەو تایتلّەی کە سەرەنجام شتاینبێك بۆ رۆمانەکەی هەلّیبژارد جەخت لەسەر لە پێشبینی بەدەربوونی بوون و ئومێدی بوون دەکات، خەونی بابردەلّو بەزایەچووی لێنی و جۆرجیش بۆ "ژیان وەکو خوا پێداوان بەبەرووبوومی زەوی و زار" لە شیعرێکی رۆبەرت بێرنسەوە وەرگیراوەو تایتلّی رۆمانەکەیش تایبەتمەندێتی و خەسلّەتی گۆڕەکی "بەرنامە زۆر باش دارێژراوەکان" نیشان دەدات. شیعرەکە باس لە مشکێکی کلّۆلّ و بەلەنگاری نێو دەشت و دەرو کێلّگە دەکات کە گاسن مەنواو پەناگاکەی تەخت و خاپوور کردووە:

بەڵام، مشکۆڵە، تۆ ئەو ڕێیە نیت
کە ڕەنگە بۆ سەلماندنی پێشبینییەکان بێهوودە بێت:
ئەو بەرنامە زۆر باش داڕێژراوانەیش نیت
لەبارەی مشك و بنیادەمەوە
کە لەو دیووی شادییەکدا گەلەکۆمە دەبەستن و
هیچ شتێك بۆ ئێمە جێ ناهێڵن
بێجگە لە ئازارو ماتەم، ئەویش
لەبری ی ئۆخژن و شادییەکی گفت پێدراو.

هەروەکو چۆن لەسەرەتاو لە کۆتاییشدا بە تەواوەتی ڕاڤەکراوەتەوە، خەونەکەیان شانۆنامەیەکی کورتە لەنێو شانۆنامەیەکی درێژتردا، لەگەڵ ئەوەی کە جۆرجی ئەکتەری خووڕەوشت باش دێڕەکانی ڕۆڵەکەی خۆی لەبەر دەڵێتەوەو لێنیش جەماوەری شێت و شەیدا و ئەفسوونکراوێتی. هەریەکەو ڕۆڵی خۆی هەیە و لەو بە ئەزبەر خوێندنەوەیەی کە ئابڕوویەکی شکۆمەندانە بە هەردوو قەلەندەرە هەژارەکەو کتێبەکە خۆیشی دەبەخشن. سەرەتا بەوە دەچوو کە ئەو دیدە مەحاڵ بێت کە هەر تەنها لە هزردا بوونی هەیە، هەر تەنها لەو وشە وێردئاسا ئەفسوناوییانە دایە کە جۆرج بۆ لێنی دووپاتیان دەکاتەوە. بەڵام بوون بە خاوەن زەوی و زار دەبێتە ئەگەرێکی ڕاستەقینە. کاندی پارەی هەیە، جۆرج شوێنەکەی هەڵبژاردووە و هەر چوار کرێکارە پەرۆشەکانیش کارەکانی ڕۆژانەیان بەسەر خۆیاندا دابەش کردووە. ئەمە لەوانەیە هاو نزیکبوونی ئەو بڕیارو سووربوونە بێت کە ئەو دیدو ڕامانە دروست دەکات، دەقەکە خۆیشی، لە ڕاستیدا نزیکەی هەر هەموو کتێبەکانی شتاینبێك، بەشێوەیەکی هەمەگیر و لە ئاستێکی جیهانگەرادا سەرنج ڕاکێشە. لە ساڵی ١٩٢٤ دا شتاینبێك بۆ هاوڕێیەکی کۆلێژی نووسیوویەتی و دەڵێت: " یادەوەرییەکانی زۆر زووم لە بارەی دایکمەوەن، کە پێی دەگوتم چۆن

چۆنی پیاوان دەتوانن ببنە بوونەوەری جیلوەدارو درەوشاوەی خاوەن باڵی سپی گەورە گەورەو هەر هەموویشی لە ڕێی وتنی وێردوستایشی سادەو ساکارەوە دەهاتەدی." تا ڕادەو پلەیەکی گەورەتر یاخود بچووکتر، پاشماوەی فشارو کاریگەریی ئا ئەو ڕۆمانسییەتە سەرتاسەری کارەکانی شتاینبێك، بەتایبەتی ڕۆمانەکانی سەردەمی تازەکاریی ئەویان شەقار دەکرد. سەرگورو شتەی سالآنی زووی ژیانی نەخشەی وردە وردە بەرزبوونەوەی توانای ئەویان دەکێشا، پتر بۆ بەکارهێنانی نەك بۆ ئەوەی لەلایەن ئەو مەیل و هەوەسە ڕۆمانسییەوە کۆنترۆڵ بکرێت. لە ساڵی ١٩٣٦دا، لە ڕۆمانی "مشك و بنیادەم"، کە گەلێك لە ڕەخنەگرەکان بە باشترین ڕۆمانی ئەو لە قەڵەمیان دا، نووسەر بەسەر پیشەکەی خۆیدا قەڵەمڕەوی پەیداکردو بۆ بیروباوەڕە پتەو و ڕوختەکەی خۆی دەنگێکی، نەك لە ناو پێشکەوتنی مرۆڤ، بەلکو لە پۆتانسیەلی مرۆڤدا بۆ خۆی دۆزییەوە.

کۆڤیچی — فریدی لە بیست و پێنجی شوباتی ساڵی ١٩٣٧دا ڕۆمانی "مشك و بنیادەم" ی بلاوکردەوە، هەر کۆپییەکیش نرخی دوو دۆلاری لەسەر دانرابوو. هەر دوای ئەوە لە مانگی ئازاردا بوو بە هەڵبژاردەی یانەی کتێبی مانگ و بەخێراییەکی بێڕادە دەفرۆشرا (تێکڕای فرۆش لە مانگی یەکەمدا هەزار کۆپی بوو لە ڕۆژێکدا ) و هاوشانیش لەگەڵ کتێبی "چۆن هاوڕێ پەیدا دەکەیت و کار لە خەڵك دەکەیت و ڕۆمانی لەگەڵ بادا ڕۆیشتوو" دا کەوتە ناو لیستی پڕ فرۆشترین کتێب لە سەرتاسەری ولآت دا و بە ڕوختەیی و قایمی شۆڕەتی دەرکەوتووی شتاینبێکی دامەزراند. ڕەخنەگرانیش کتێبەکەیان بە پەرۆشییەکی جیهانگەراوە خوێندەوە. هێنری سیداڵ کابنی لە گۆڤاری ساتردەی ڕیڤیوودا نووسی: " ڕۆمانی مشك و بنیادەم، دەبێ هەموو کەسێکی خۆشنوود بکات، چونکە هەموو ڕەگەزێکی چیرۆك گێڕانەوەی پەسەندو باشی تێدایەو هەروەها.. زۆربەی ڕۆمانە سەرکەوتووەکانی ئەم سالآنەی دواییمان،

هەر کرۆك و گەوهەرێکی هونەرییان هەبوو بێت، بەوە سەرکەوتووبوونە کە سنووری زۆربەی یاساکانی هونەری چیرۆك گێرانەوەیان بەزاندووە بۆ ئەوەی جەخت لەسەر ئایدیۆلۆژیاو تەووژمی هۆش، یاخود ڕەفتارگەرایی بکەن."
شتاینبێك بەوە ستایش کرا کە نووسەری پرۆلیتاریایەو "لە وێناندنی پیاوی بچکۆلەیشدا مروەتێکی تایبەتمەندو دەگمەنی هەیە." لوویس گانێتیش نووسی: " ئەوە سۆزو بەزەیی خۆیەتی کە جۆن شتاینبێکی هونەرمەند زۆر بە توندی لە هەموو ئەو وێنەگرە واژەیی و زمانەوانییە بچکۆلانە جیادەکاتەوەکە.. لەنێو بۆتەی کتێباندا بەیەکدادەچن و دەئالۆزێن."
ئەو هاوینە "ڕۆمانی شانۆنامێز" کە لەلایەن تییاتەریوونیەنی سان فران سیسکۆوە نووسرابوو نوێنرا)، نواندنی بەرهەمەکە لە بیست و یەکی مایسی ساڵی ۱۹۳۷ دا بۆ ڕەخنەو هەڵسەنگاندنە پەسەندو لایەنگرەکان کرایەوە و بۆ دوو مانگ بەردەوامبوو. بەهەر حاڵ، ئەزموونی شتاینبێك وەکو فلیمنامەیەك لەگەڵ ڕۆمانەکەدا، پێویستە بە بۆرخواردوو لە قەڵەم بدرێت، بەلاّم نامادەکردن و ڕێکخستنیشی بۆ شانۆیەکی مەزنی نیویۆرك بایەخ و زەرووەتی کارەکەی سەلماند. کاتێکیش، چەند هەفتەیەك پاش بلاّوبوونەوەی ڕۆمانەکە، جۆرج کۆفمان خولیاو حەزی بەرهەمهێنانی "مشك و بنیادەم" ی لەسەر شانۆی برۆدوەی دا دەربڕی، بۆ شتاینبێکی نووسی و پێشنیاری چەند گۆڕانکارییەکی کردو وتی: " پێویستە ژنەکەی کێرلی زیاتر بەرجەستەبکرێت... چونکە هێزی بزوێنەری تەواوی شتەکەیەو دەبێ گەورەتر دەربخرێت. لەسەرووی هەموو شتێکیشەوە پێم وایە زۆر گرنگترە ئەگەر شەڕەکەی کێرلی — لێنی بەهۆی ژنەکەوە ڕووبدات."
لە کاتێکا کە پێشنیارەکانی کۆفمان سووکایەتییان بە بەرکەماڵیی ئەو دەقە زۆر ناتۆراڵیستیە دەکرد کە تیایدا تاقە کەسێك هەر بە تەنها بەرپرسیاری دەرەنجام نییە، بەلاّم ئەو لەگەڵ ئەوەیشدا شوناسی ئەو کاراکتەرە

دیاری دەکات کە لەگەڵ کرووکس و کاندی دا جوغزی تاق و تەنیایی ئەو دەکات، ئەو ئافرەتەی کە وزە و توانا رکێف نەکراوەکەی هەر تەنها لە رۆڵەدا شەقڵ دەگرێت کە رۆڵی تیژپێکردن و تامەتامیی پێ کردن و تەنگ پێ هەڵچنینی سێکسییە. (ئافرەتەکە بەبێ چەند و چوون و هەرگیز سۆزانی نییە، یاخود بە پێی قسەی جۆزێف وود کرۆچ، "حیشەریی" نییە.) لەنێ رۆمانەکەشدا کاتێك کە ئیتر ئەو ئافرەتە "سەربوردەکەی خۆی" بە "تاسە سۆزی گەیاندن و تەماسەوە" بۆ لینی دەگێڕێتەوە، شتاینبێك بە نەرم و نیانی و ناسکییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. هەرچی چۆنێك بێت، ئەمە کە دووبارە لەلایەن شتاینبێك و کۆفمان نووسرایەوە، ئیتر ژنەکەی کێرلی بەشێوەیەکی باشترو روونتر ئەو پووچی و بێ هوودەییەی دەربڕی کە تەقریبەن لە لایەن هەموو کارکتەرەکانەوە سڵی لێدەکرایەوە:

"بێگومان من مێردم هەیە،" ئەمە، لەو گفتوگۆیەی کە دەستبەجێ، دوا بە دوای کوشتنی سەگەکەی کاندی خراوەتە سەردەقەکە بە جۆرج دەڵێت: "بەلاّم هەرگیز لە ماڵ نییە. کەس نییە لەگەڵیدا قسەبکەم، کەس نییە لەگەڵیدا بم. تۆ لەو بڕوایە دایت کە من بتوانم تاق و تەنیا لە ماڵەوە دابنیشم و هیچ شتێك نەکەم و هەر تەنها چاوەڕوانی کێرلی بم؟ دەمەوێ یەکێك ببینم. هەرکەسێك ببینم و لەگەڵیدا قسەبکەم. لێرە ئافرەت نییە. منیش پێم ناکرێ بچمە ناوشار..." لەدوا پەردەی شانۆگەرییەکەیش دا شتاینبێك خەونەکەی ئەوی متوورفەی دەستنووسەکە کرد، کە خەونێك بوو هەروەکو خەونەکەی لینی و جۆرج ئاسایی بوو:

"کاتێ کە ئەو پیاوە دەیویست من بخاتە فلیمەوە، بیرم لە گریتا گاربۆ کردەوە. کچێکی هاوڕێم هەبوو ئەویش دەیویست وەکو گریتای لێ بێت. بەلاّم گریتا هەمیشە دەوڵەمەندە، منیش وام پێ چاکترە کە وەکو جەوان بلۆندێلم لێ بێت، کە هەمیشە هەژارو نەدارەو دیدارو بەرخوردی پیاوێکی بەلەنگازیش دەکات و عاشقی یەکتری دەبن."

ئـــەو، دەق وەكـــو ئـــەوانی دی، ناتـــاجێكی ســـادەو بـــیّ رتـــووش بەرجەســـتەدەكات، بـــۆ جێگایـــەك، بـــۆ پلـــە و پایەیـــەك كـــە لـــە لایـــەن رۆڵ بینینێكـەوە پێـی بەخـشراوە. هـەر تـەنها سـلیمی شـكۆداری لیّ دەرچـێت — كـە پیاوێكـە خـاوەنی پلـەو پایەیـەكی بـەرزە، پیاوێكـە خـاوەنی بیروڕایـەكی قـایم و ڕوختەیـە — ئـیتر هـەر هـەموو ئـەوانی تـر منـەی شـەقڵ بـۆ ئـەو ژیانـەیان دەكـەن كە وەكی تر بیّ شەقڵ و نارێك و پێكە.

جـۆن مەیـسن بـراون نووسـیوویەتی و دەڵـیّ: ڕۆمانەكـەی شـتاینبێك لەسـەر شـانۆدا " وەكـو هەسـت و سـۆز بـزوێنترین بەیاننامـەی ئـەو تـاق و تەنیاییـەی مـرۆڤ بەدیاردەكـەوێت كـە شـانۆی هاوچـەرخی ئێمـە بەرهـەمی هێنـاوە." بـرووكس ئاتكینـسنیش لـــە نیویـــۆرك تـــایمز ڕیڤیـــوودا ڕایگەیانـــد كـــە: " هونـــەرو تایبەتمەنـدێتی سروشـتبەزێنی چـیرۆكەكە، لەسـەر شـانۆ و بـە چـاپكراویش، بەركـەماڵی عـاتیفی لیرێكـی هـەر هـەموو ماتێریاڵـە بەراییەكانـە." زۆربـەی ڕەخنـەگرانیش ستایـشی شـەفافییەت و ویـژدان و ئیرادەداریـی واقیعییـەتی كارەكـەیان كـرد. دەسـتپێكردن و نوانـدنی كارەكـەیش لـە ٢٣ی نۆڤەمبـەری سـاڵی ١٩٣٧ لـە سەرشـانۆی میوزیـك بـۆكس دا، شـانۆگەری "مـشك و بنیـادەم" ی كۆفمـان(كـە والالـس فـۆرد دەوری جـۆرج و برۆدریـك كراوفـۆرد دەوری لێنـی و كلـەیر لیـووس دەوری ژنەكـەی كێـرلی و ویـل گییـر دەوری سـلیمیان تیـادا بینـی) دەسـتبەجیّ خـەلاتی "نیویـۆرك درامـا كـریتیكس سـێركل" ی هـەمان سـاڵی بـۆ خـۆی بـەرزەفت كـرد. (تـەنها یـەكێك نـەبێت لـەو شـانزە ئەندامـە دەنگـدەرە، ئـەگینا ئـەوانی تـر هـەر هـەموو دوا بـە دوای دەسـتپێكردنی نمایـشی شـانۆگەرییەكە، ستایـشێكی دەمودەسـتانەی شـانۆگەری "مـشك و بنیـادەم" یـان كـرد و هەمـەگیی پەسـەند یـان كـرد. شـانۆگەرییەكە دوو دانـە كێبـەركیّ كـەری ئێجگـار پێـشوازی لیّ كـراوی وەلاوە نـا، كـە یـەكێكیان شـانۆگەری "شـارەكەی ئێمـە" ی تـۆرنتن وایلـدەر بـوو كـە (خـەلاتی پـۆلیتزەری باشـترین شـانۆگەری

دەستەبەرکرد بوو) و ئەوی دیشیان "کوڕە زێڕینەکە"ی کلیفۆرد ئۆدیتز بوو شانۆگەرییەکەی کۆفمان کە بۆ ۲۰۷ جار نواندن بەردەوام بوو بێ کەم و زیا بەقەدەر ڕۆمانەکە خۆی و نوسخەی دەستکاری کراوی فلیمەکەی لوویس مایەلستۆن کە لە ساڵی ۱۹۳۹ دا بلاوکرایەوە ((کە هەروەکو "تیپاتە نارتس" نووسیوێتی و دەڵێت:

"سەرسامکەرانە لە ڕۆحییەت و شێوازێکی بێخەوش دا بوو" ))شۆرەت و ناوبانگی بە شتاینبێك بەخشی.

هەروەها هاوکات بۆ نووسەرەکە تێکستەکەیش بەدناوییەکی بێڕادەوبەربلاوی دەستە بەرکرد. ڕەخنەگرێك بۆ " کاتۆلیك وۆلد" نووسیوێتی و دەڵێت: " چەند لاپەڕەیەکی سەرەتای کتێبەکە هێندە منیاز پەرێشان و نەفرەتئەنگێز کرد کە چیدی بەرگەی ئەوەم نەگرت شەو کتێبەکە لە ژوورەکەمدا بهێڵمەوە." ستاسیۆنی پۆلیسی پرۆڤیدەنسی ڕۆد ئایلانديش لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۳۹ دا ئەوەی ڕەت کردەوە کە مۆڵەت بە شانۆگەرییەکی ئاوا " سووك و چرووك" بدات. لە مانگی شوباتی ساڵی ۱۹٤۰ یشدا، فلیمەکە لە ئوستورالیا قەدەغە کرا. لە کانوونی یەکەمی هەمان ساڵیش دا، نیویۆرك تایمز رایگەیاند کە لە ئێف. تی. ماك کلیلان لە ئالاباما، "کەشیشەکان" بەرامبەر بەوەی کە فلیمی "مشك و بنیادەم" ی (مایەلستۆن) لە ئێوارەی کریسمەس دا پیشان بدرێت، نارەزاییان دەربڕی و بەبێ بینینی و پێشوەختیش وەکو شتێکی " ترسناك و فەساد ئامێز" مەحکوومیان کرد لە دەرەنجامی ئەوەیشدا مەیجەر جەنەراڵ هاسکێل فەرمانی ئەوەی دا کە پشاندانی فلیمەکە ئیلغا بکرێتەوە." کتێب و شانۆگەرییەکە و فلیمەکەیش – کە بە خێرایی یەك بە دوای یەکدا هاتن – تا ڕادەیەك گەلێکیان لە خەڵکی ئەمەریکی نیگەران کرد، چونکە ئیمان و بڕوای میللەتەکەیان بە خەونێکی جادووگەرانە، بە دەستپێکردنێکی تازەو ماڵێکی

پۆشــــتەو رێکوپێــــك، وردو خـــاش کـــرد. تـــا رادەیـــەکیش دایەلۆگـــە ناتۆرالیـستییەکەی شـتاینبێك خـەڵکی رەنجانـدو بـەردەوامیش بـوو لـە خـەڵك رەنجانـدن (چـونکە رۆمانەکـە یـەکێك بـوو لـەو رۆمانانـەی کـە جـاردوای جـار لەلایـەن ئەنجوومـەنی قوتابخانـەکانی سەرانـسەری ولاتـەوە قەدەغـەبکرێت). دێرەکـانی، تەنانـەت هـەتا ئـەو دێڕانەیـشیان کـە بەدیقـەت و ناگـاوە بـۆ سـەرشانۆ و بـۆ نـاو فلیمەکـەیش سانـسۆرکراون، بـەهێزو مەحکـەمن. کەچـی وێـڕای ئـەوەیش شـتاینبێك لـە رۆمـانی "مـشك و بنیـادەم" دوو سـاڵ دوای ئـەویش لـە رۆمـانی "هێـشووەکانی تـووڕەیی" دا پەیگیرانـەو جەختکەرانـە بـەرگری لـە دایەلۆگـەکانی خـۆی کـرد. شـتاینبێك لـەدوادوای سـاڵی ١٩٣٩ یـشدا بـۆ دایکـی تەعمیـدیی خـۆی نووسـی و دەڵـێ: " ماوەیـەکی درێژخایەنـە زوبـانی کتێبـان لەگـەڵ زوبـانی پیاوانـدا جیـاوازە. بـۆ پیـاوان، نووسـین لـەبارەی کفربێژییـەوە، زەخرەفـەو رازاندنـەوەی نێـو دەقەکانـەو هـەرگیزیش رەمـەکی و بازارییانـە نییـەو سـەرومڕیش تەقـەڵلا دەدەم هـەر بـەو شـێوەیە بینووسـم." ئەگەرچـی سـەخت و کێـشە نـامێزە، بـەلام لیریکییـە، ئەگەرچـی ریالیـستییە، بـەلام لەگـەڵ ئەوەیـشدا سـیمبۆلییە: ئـەم پەیڤانـە وەسـفی هـەردوو ئـەو پەخـشانەی کـە شـتاینبێك لـە ئـاخرو ئـۆخری سـاڵی ١٩٣٠ یەکانـدا بەرکـەماڵی پێبەخـشی و ئـەو دنیابینییـە هونەرییـەیش دەکـەن کەناسـەقامگیرترین سـێیینە رۆمـانی ئـەویان بەرهـەم هێنـا کـە ئـەوانیش: لە شەرێکی گومانئامێزدا و مشك و بنیادەم و هێشووەکانی تووڕەیین.

کاریگـەریی رۆمـانی "مـشك و بنیـادەم" یـش، لەبـەر سـەرکەوتنی وەکـو کتێـب و شـانۆگەری فلیم لـە مێـژووی ئـەدەبیاتی ئەمەریکیـدا نـاوازە و بـێ هاوتایـە. رەنگـە ئـەو کاریگەرییـەیش بـە باشـترین شـێوە بـەو ئیقتیباسـە پوخـت و خولاسـە کرابێتـەوە کـە لەلایەن خەلاتی دراما کریتیکس سێرکلەوە خراوەتەڕوو. ئیقتیباسەکەیش دەڵێت:

"لەبـەرهێزو توانـای راسـتەوخۆ و حـاڵیبوون و دەرك کردنـی بـە چـۆنێتی مامەڵـەکردن لەگـەڵ بابەتێکـدا کـە راشـکاوانە لـەنێو ژیـانی ئەمەریکیـدا

ڕەگاژۆیــە: لەبەرچارەســەرکردنی کالیتــەو تایبەتمەنــدێتی جیــددی ئامرازەکــانی ڕۆمانەکــە، لەبــەر ڕەتکردنــەوەی ئــەوەی کــە ئــەم لێکۆڵینەوەیــە والێبکــات کــە لـــەبارەی تـــاق و تـــەنیایی و بێبـــەربوون و ناکامییـــەکی کارەســـاتبارانەی هەرزانبــەها یــاخود کاریگــەر و مەزنــەوە بێــت، ئینجــا لــە کۆتــاییش دا، لەبــەر ســادەیی و هێــزو چــڕوپڕی و بــەردەوام هەڵکــشانی کــارکردی دەقەکــە لەســەر شانۆدا" لەوانەیــە ئــەم وشــانە زۆر بــە باشــی بتــوانن ببنــە ئیقتیباســێك بــۆ خزمــەت کردنی ڕوونترین و ڕاشکاوترین ڕۆمانی جۆن شتاینبێك.



چــەند میلێــك لــەخوارووی ســۆلێدادەوە، ڕووبــاری ســالیناس نزیــك بــە یــاڵی گردۆلکەیــەك، قــووڵ و ســەوز دانگــەڕێژە دەکــات و دەڕوات. ئاوەکەشــی گەرمــە چــونکە بەرلــەوەی بگاتــە گــۆلاوە تەنگەبەرەکــە بــە بریــسکە بریــسکەوە بەســەر لــە زەردەکـــانی بـــەرخۆرەتاودا هەڵدەخلیـــسکێ و دەکـــشێ. بەســـەر ڕۆخێکـــی ڕووبارەکــەدا کۆمەڵــە تەپۆلکەیــەکی تــەلایی لێــژ هــەتاکو چــیا دژوارو ســەختە بەردینــەکانی گــابیلان کەوانــە دەبەســتن، بــەلام لــە ڕۆخــی دۆڵەکــەدا ئاوەکــە لەگــەڵ چــەردە درەختێکــدا، چــەردە شــۆڕەبییەکدا ڕیــز دەبەســتێ کــە هــەموو بــەهارێك ســەرلەنوێ تــازەو ســەوز دەبنــەوەو بەســەر گــەلا شــۆڕەوە بــووە تێکنالاوەکانیانــدا خــارو خاشــاکی لافــاوی زســتان هەڵــدەگرن، هــەروەها لەگــەڵ چــڵ و چــێو و لقــە ســپییە پەڵــەدارە شــۆڕەوە بووەکــانی ئــەو دار چــنارانەیش دا ڕیــز دەبەســتێ کــە بەســـەر گۆلاوەکـــەدا تـــاق و کەوانـــە دروســـت دەکـــەن. لەســـەر ڕۆخـــی لمینـــی ژێـــر درەختەکانــدا بــەزۆرو زەبەنــدیی گــەلاکان هــەڵوەریوون و ئەمەنــدە وشــك و قرچــۆکن کـــە تەنانـــەت ئەگـــەر مارەســـەمەندەرێکیش بەنابەینیانـــدا ڕەت بێـــت ئـــەوا خشەخــشێکی بێهاوتــا بــەرپا دەکــات. نێــوارانیش کەروێــشکەکان بــۆ ئــەوە لــەنێو

بێـــشەلاَنەکانەوە دێنـــە دەرەوە هـــەتا لەســـەر لەکانـــدا چیـــچکان بکـــەن، ڕووتەختانییـــە لماوییـــە غـــدارەکانیش بـــەجێ پێـــی شـــەوەکییانەی ڕاکوونـــەکان و شـوێن پێـی پەرشـوبلاوی سـەگی مـەزراکان و جـێ پێـی دووقەڵـشی ئـەو ئاسـکانە داپۆشرابوون کە بە تاریکی بۆ ئاوخواردنەوە دەهاتنە ئەوێ.

لـەمابێنی داربـی و چنارەکانیـشدا باریکـە ڕێیـەك هـەبوو، باریکـە ڕێیـەك کـە بـە پیاڕۆیـشتنی بێـشوومـاری کورگەلانـەوە مـشتومـاڵ کرابـوو کـە بـۆ ئـەوە لـە مەزراکانـەوە دەهاتنـە ئـەوێ تـا لـە گۆمـاوە قووڵەکـەدا مەلـەوانیی بکـەن، هـەروەها بەپیاڕۆیـشتنی بێـسنووری ئـەو قەڵەندەرانـەیش بەسـەختی پێمـاڵ کرابـوو کـە ئێـواران پرزەبـڕاوو شـەکەت لـە شـارێگاکانەوە دەهاتنەئـەوێ بـۆ ئـەوەی لـە تەنیـشت ئاوەکـەدا ئـۆقرە بگـرن و بحەوێنـەوە. لەبـەردەم لقـی نزمـی ئاسـۆواری دارچـنارێکی زەبەلاحیـشدا کەڵەکـە خۆڵەمێـشك هـەبوو کـە دیـاربوو لـە سـۆنگەی کردنـەوەی چـەندین ئـاگر لەوێـدا چـێکرابوو، لقەکـەیش بـەهۆی ئـەو پیاوانـەوە ساف و لووس کرابوو کە بەردەوام لەسەریدا دانیشتبوون.

ئێـوارەی ڕۆژێکـی گـەرم شـنەبایەکی کـز لەمابـەینی گەلاکانـدا دەسـتی بـە جووڵانـەوە کـرد. تاریکاییەکـەیش ڕووەو سـەرەوە بـە زووررگەکـەدا هەڵـشاخا. لەســەر لێــوارە لمییــەکانیش دا کەروێــشکەکان چەشــنی پەیکــەرە داتاشــراوە بەردینـە کەوەییـەکان کـپ و بێـدەنگ ڕۆیـشتن. تـا لـەو کاتـەدا کتـوپڕ لـە ئاقـاری کەڵـە ڕێگاکـەوە دەنگـە دەنگـی هـەنگاونان لەسـەر گـەلای وشـك و قرچـۆکی دار چـــنارەکانەوە هاتنـــە بـــەرگوێ و کەروێـــشکەکانیش بێـــەرو ســـەداو دەســـتوبرد بۆخۆشـاردنەوە کەوتنـە پەلـەپرووزێ. ئینجـا شـینە شـاهۆیەکی لاق درێـژ بەسـتی و دژوارییەکـــەوە بـــە ئاسمانـــدا بـــەرزبووەوەو بەهێواشـــی و قورســـییەکەوە بەســـەر ڕووبارەکـــەدا خواربـــووەوە. بـــۆ چـــرکە ســـاتێك ئـــەو دەوروبـــەرە گیـــانی بەبـــەرەوە نـــەما، دوای ئـــەوەیش دوو پیـــاو لـــە باریکـــە ڕێگاکـــەوە بەدیارکـــەوتن و پێبـــەپێی گۆماوە سەوزباوەکە بەرەو ڕوتەنییەکە هاتنەدەرێ.

بەیـــەك ڕیـــزی دوابـــەدوای یـــەك بەباریکـــە ڕێگاکـــەدا دەڕۆیـــشتن و شـــۆڕ دەبوونـــەوە، هـــەتاکو دوای هاتنـــە نێـــو ڕێگـــا پـــانوپۆڕە سەرەکییەکەیـشەوە هـەر تـاوا دوا بـە دوای یـەك مانـەوە. هـەردووکیان پـانتۆڵ و پـاڵتۆی لـە قوماشـی جـین دروسـت کـراوی دوگمـە مـسینیان پۆشـی بـوو. هەریەکەیـشیان شـەپقەیەکی ڕەشـی چـرچ و لۆچـاوییان لەسـەرداو بەتانییـەکی سـفت لوولدراویـشیان بەسـەر شـانیاندا شـۆڕکردبووەوە. پیاوەکـەی پێـشەوەیان بـچکۆلانەو گـورج و گـۆڵ و ڕووخـساری ڕەشـتاڵەی چـاو زیتەڵـەی بـەناگاو سـەرو شـکڵ دیـارو توندوتیـژبوو. هـەموو ئەنـدامێك لـە ئەندامـەکانی لەشـی دیـارو ئاشـکرابوون، دوو دەسـتی بـەزەبری بـچکۆلانە و دوو بـازووی باریـك و زراڤ و لـوتێکی بەلـەباریك و نێـسکینی هـەبوو. بـەڵام ئـەوەی لـە دوای ئەمـەوە دەڕۆیـشت تـەواو پێـچەوانەی ئـەو بـوو، پیـاوێکی کەتـەی زەبـەللاحی خـاوەن دەموچـاوێکی ناڕێـك و پێـك و دزێـو و دووچاوی گـەورەی کـز هەڵگـەڕاوو دووشـانی پـانوپۆڕی بـەرەو خـوار داکـەوتوو بـوو، بـە سـەنگینییەوە دەڕۆیـشت و ئـەختێك پێیـەکانی بـەدوای خۆیـدا بـەکێش دەکـرد، ڕێـك بـەو شـێوەیەی کـە ورچـێك پـەنوپێ چنگدارەکانی خـۆی بـە کـێش دەکـات. باسـکەکانی هـیچ بەلاتەنیـشتەکانیدا نـەدەبزوان، بـەڵکو هـەروا شـۆڕ ببوونـە خوارەوە.

کـە گەیـشتنە ڕوتەلانییەکـە ئـەو پیـاوەی کـە لـە ئـوواوە دەڕۆیـشت لـە پڕێکـا وەسـتاو ئـەوەی کـە بەدوایـشییەوە دەڕۆی هەنـدەی نـەمابوو خـۆی پیـادا بکێـشێ. شـەپقەکەی داکەنـدو بەپەنجـەی دۆشـاو مـژەی شـریتی ئارەقـە چـنینەوەکەی سـرییەوە و تەڕاییەکەشـی گرتـەدوور. هاودەمـە زەبەلاحەکەیـشی پـەتووەکانی خـۆی توورهەڵـداو خـۆی هاویـشتە سـەر عەرزەکـە و لەسـەر ڕووی گۆمـاوە سـەوزەکەدا کەوتـە خواردنـەوە، بـەبێ و قـومی درێژخایەنـەوە کەوتـە خواردنـەوە و وەکـو ئەسـپیش پرمـەو کورکـە کـورکی خـستە ئاوەکـەوە. پیـاوە بـچکۆلانەکەیش بە ڕق و تووڕەییـەکەوە بەرەو ڕووی ئەو ڕۆیشت.

بــە توندوتیژییەکــەوە وتــی: " لێنــی! لێنــی، بــۆ خــاتری خــوا ئەوەنــە مــەخۆرەوە." بــەڵام لێنــی ســەرومڕبوو لــەوەی کــە پڕمــەو کورکــەکورك بخاتــە نێــو گۆماوەکەوە.پیاوە بچکۆلانەکە بەسەریدا چەمایەوەو شانی ڕاوەشاند.

"لێنی. وەکو دوێنێ شەو هەمدیس نەخۆش دەکەویتەوە."

لێنــی تــەواوی کەللــەی خــۆی بەشەپقەکەشــەوە کــرد بــە ژێــر ئاوەکــەوەو دواجــار لەســەر قــەراغی ڕووبارەکــەدا ڕۆنیــشت و شەپقەکەشــی بەســەر پاڵتــاوە شــینەکەیدا چــۆڕەی دەکــردو بەسەرپــشتیدا دەهاتــەخوارەوە." ئــای کــە خۆشــە، جــۆرج، تــۆیش هەنــدێك بخــۆرەوە. تــۆیش ئــاوێکی خــۆش و چــاك بخــۆرەوە." ئەمــەی وت و شادمانانە خەنییەوە.

جــۆرجیش کۆڵەکــەی خــۆی هــەڵبڕی و بــەکاوەخۆ لەســەر ڕۆخەکــەدا دایئــاو وتــی: " لــەوە دڵنیــانیم کــە ئــەم ئــاوە پــاك و ســازگاربێت، بنــۆڕە، کــەفناڵوودەو پیس و پۆخڵ دیارە."

لێنــی چــنگە زل و گەورەکــەی خــۆی خــستە نێــو ئاوەکــەوە و ئەنگوســتەکانی لــەناویا بــاداو بــەو شــێوەیە هەنــدێ شــڵپ و هــوڕی بــچکۆلە و ورد لــە ئاوەکــەوە بــەرزبووەوە و ئەوســا ئەڵقــەو بازنــە ئاوییــەکان بــڵاو و بــەرفراوانتر بوونــەوەو لەمــسەرەوە بــۆ ئەوســەری ڕووی گۆماودکــە ڕۆیــشتن و دووبــارە جــارێکی تــر گەڕانەوە. لێنی چاودێری ڕۆیشتنیانی کردو وتی:

"جۆرج، تەماشاکە. تەماشا چیم بەرپاکرد."

جــۆرج لەتەنیــشت گۆماوەکــەدا کەوتــە ســەرچــۆك و بــە لەپــەکانی شڵپەشــڵپ بــە خێرایــی ئــاوی خــواردەوەو پێــی لێنــاو گــوتی: " تــامی خــراپ نییــە، لەگــەڵ ئەوەشــدا، لــە ڕاســتیدا بــە ئــاوێکی خــۆڕ ناچــێت. لێنــی، هــەرگیز نــابێ ئاوێــك بخۆیتــەوە کــە ڕەوان و ڕۆیشتوو نییە،" ئەمەی بەبێ ئومێدییەکەوە وت. ئینجا وتی:

"ئەگــەر تینووشبت بــوو ئــەوا لــە ئــاوەڕۆ و جۆگەلەیەکدا ئــاو بخــۆرەوە." ئەوســا شــڵپێك ئــاوی لــە دەموچــاوی خــۆی داو بەدەســتەکانی ژێــر چــەناگەو دەوروبــەری

پـشتەمل و ئەسـكوردى خـۆى شووشـتەوە. دواجـار شـەپقەكەى لەسـەرنايەوەو لـە رووبارەكـە خـۆى دوورخـستەوە، ئـەژنۆكانى كێشايە دواوەو لـە ئـامێزى گـرتن. لێنـیش كـە چـاودێرى دەكـرد، دەقـاودەق چـاوى لـە جـۆرج كـردو لاسـایى كـردەوە. بـەرەو دواوە گەڕايـەوەو ئـەژنۆكانى خـۆى كێشايە دواوەو لەباوەشـى گـرتن. ئينجـا ڕوانييـە جـۆرج تـا بزانـێ داخـۆ ڕاسـت و دروسـت لاسـايى كردنەوەكـەى هێناوەتـەوە يـان نـا. ئەوسـا نـەختێكى تـريش شـەپقەكەى بەسەرچـاوەكانيدا خـواركردەوە، تـاكو ئيتر تەواو بە شەپقەكەى جۆرج شەباهەت پەيدا بكات.

جـۆرج بـە دلتـەنگى و غەمبارييەكـەوە چـاوى برييـووە ناوەكـە. پرشـنگى هـەتاو لێـوارو دەورى چـاوەكانى سـوورهەلگێڕا بـوو. بـە تووڕەييەكـەوە وتـى: " هـەر بـە سـواريى دەمـانتوانى بگەينـە مەزراكـە ئەگـەر ئـەو شـوفێرە نامـەردەى پاسـەكە بيزانيبايـە ئـەبارەى چييەوە دەناخفێـت. وەلێ ئـەو پێـى وتـين: " هـەر چـەند هـەنگاوێك لـە خـوار رێگاكەوەيـە، هەرچـەند هەنگاوێكـە." بەلەعنـەت بـێ نزيكـەى چـوار ميـل دوورە، بـەلێ هـەر ئـا ئـەوە بـوو! نەيدەويـست لەبـەر دەروازەى مەزراكـەدا بوەسـتێت. هـەر ئـەوەبوو هيـچى تـر. لەعنەتيينـە فـرە لـەوە تـەوەزەل تـر بـوو لابـدات و بوەسـتێت. هـەرگيزيش بـڕوا بـەوە ناكـەم كـە پيـاوێكى ئەوەنـدە مـاقوولْ بووايـە لـە سۆلێداد ڕاييگرتبايـە. بۆيـە لـە پاسـەكە وەدەرى نـاين و وتـى: " هەرچـەند هـەنگاوێك لـە خـوار رێگاكەوەيـە." مـن خاترجـەمم كـە مەوداكـە لـە چـوار ميليش پـتر بـوو، ئـەفرەتى ئيبـێ لـە ڕۆژێكـى گـەرم و ناخۆشـى ئـەنا وايـشدا دەستخەڕۆى كردين.

لێنى بەترس و شەرمێكەوە سەيرى كردو وتى: " جۆرج؟"

"ها، چيت دەوێ؟"

"جۆرج ئێمە بۆ كوێ دەچين؟"

پيـاوە بـچكۆلانەكە كێـشاى بـە لێـوارى شـەپقەكەى خـۆى داو بـە مرومۆچـى و خێـسە كردنـەوە ڕوانييـە لێنـى و گـوتى: " كەواتـە تـۆ ئـەوەت لەبيرچـوو، هـا،

وانییــە؟ جــا پێویــستە هەمــدیس پێتــی بڵێمــەوە، وانییــە؟ ئــەی خــودای گــەورە، چیت لێ بکەم هەی نارەسەنی شڕوشێت!"

لێنــیش بەناســکی و هێمنییەکــەوە وتــی: " بــەڵێ لــەبیرم چــوو، هــەوڵم دا لەبیرم نەچێت، بەخوا بەڕاستمە جۆرج، زور هەوڵم دا."

"دەی باشــە. باشــە دووبــارە پێتــی دەڵێمــەوە. خــۆ هــیچ شــتێکی تــرم نییــە ئــەنجامی بــدەم. لەوانەشــە ڕێــك هــەر هــەموو وەختەکــەی خــۆم ئــەو شــتانەت بــۆ باس بکەم و دواتر لەبیریان بکەیت و منیش دووبارە بۆتیان بگێڕمەوە."

"هــەر تەقــەڵلام داو تەقــەڵلام دا،" لێنــی وتــی: " کەچــی ســوودی نــەبوو. بەڵام خۆ کەروێشکەکانم لەبیرنەچووە، جۆرج."

"واز لــە کەروێــشکەکان بێنــە. هــەموو ئــەوەی کــە دەتــوانی هەمیــشە لــەبیری نەکــەیت هــەر ئــەو کەروێــشکانەن، وانییــە! ئێــستاکە گــوێ بگــرە و بــەڵام ئــەو کەرەتــە دەبــێ کۆشــش بکــەیت بــۆ ئــەوەی لــەبیری نەکــەیت هــەتا تووشــی چەرمەســەری نــەبین. ئــەوەت دێتــەوە یــاد کــە چــۆن چــۆنی لــە پــاڵ ئاودرۆکــەی ســەر شەقامی هۆواردا دانیشتبوویت و سەیری تەختە ڕەشەکەت دەکرد؟"

رووخساری لێنی خەندەیەکی شادمانانەی لەسەردا درەوشایەوەو وتی:

"ئــەی چــۆن، جــۆرج، ئــەوەم دێتــەوە یــاد.. بــەڵام.. ئــەی دوای ئــەوە چــیمان کــرد؟ دێتــەوە بــیرم کــە هەنــدێ ژن بەلامانــدا تێپــەڕین و تــۆیش وتت... تۆیش وتت.."

"هەرچییەکم وت بــەجێرو جەهەننــەم. ئێــستا تــۆ پــێم بڵــێ ئــەوەت وەبیردێتــەوە کــە چــووینە بەڕێوەبــەرێتی کاروبــاری کرێکــاران لــە مــۆرەیی ئانــد ڕێــدیی و کــارتی کارکردن و بلیتی پاسیان داینێ؟"

"ئــۆو، بێگومــان جــۆرج ئــەوەم وەبیردێتــەوە." پاشــان بــەخێرایی دەســتەکانی ئاودیووی نێو گیرفانەکانی ئەملاولای پالتۆکەی کرد.

"جۆرج... من هینەکەی خۆمم پێ نییە. دەبێ بزرم کردبێ."

بەئەسپاییەکەوە ئەمەی وت و سەری داگرت و بەدڵشکاوییەوە لەعەرزەکە ڕاما.

"تـۆ قـەت کارتـت پـێ بـووە هـەی شڕوشـێتی سـەگباب؟ هـەردووکیان ئـەوەتا ئا لێرەدان. پێت وایە دەهێڵم تۆ کارتی ئیش کردنی خۆت هەڵبگری؟"

ئەوسـا لێنـی بـە ئاسـوودەیی زەردەخەنەیـەکی کـردو وتـی: " مـن... مـن پـێم وابـوو خـستوومەتە بـەرکی لاتەنیـشتمەوە." ئـا ئەمـەی وت و دیـسان دەسـتی خستە نێو گیرفانییەوە.

جـۆرج بـە تونـدو تیژییـەوە لێـی ڕوانـی و پێـی وت: " ئـەوە چـیت لـەو گیرفانەت دەرکرد؟"

لێنی بە زۆرزانییەکەوە وتی: " هیچ شتێك لە گیرفانمدا نییە،"

"دەزانم هیـچی تیـا نییـە. ئـەوەتا لـەناو دەسـتایە. ئـەوە چـییە لـە دەسـتایە، ئەوە چییە دەیشاریتەوە؟"

"جۆرج، بەشەرەفم هیچم پێ نییە."

"دەبێنە، بمدەرێ."

لێنـی دەسـتە چـووقاوەکەی لـە جۆرجـەوە دوور ڕاگرتبـوو، وتـی: " جـۆرج، هەرتەنها مشکێکە و هیچی تر.."

"مشك؟ مشکێکی زیندوو؟"

"هـا، هـا. ئـا ئەمـە مـشکێکی مـردارەوە بـووە، جـۆرج. بەشـەرەفم مـن نەمکوشت! دۆزیمەوە، بە مردوویی دۆزیمەوە."

جۆرج وتی: " تۆ بمدەرێ!"

"ئۆی، تو ئەو خوایە جۆرج لێگەڕێ با لام بێ."

"تۆ بمدەرێ!"

دەسـتە گرمۆڵەکـەی لێنـی بـەهێوری ملـی داو جـۆرجیش مـشکەکەی گـرت و تـووری هاویـشتە نێـو بۆتەزارەکـەی ئەوبـەری گۆماوەکـە." بەهـەرحاڵ، چـیت لـە مشکێکی تۆپیوو داوە؟"

لێنی وتی: " دەتوانم کاتێ کە ڕێگاکە دەگرینەبەر بەکەلەموستم نەوازشی بکەم."

"کەواتــە، ئــیتر کــاتێ کــە لەگــەڵ منــدا دەڕۆیــت نەوازشــی مــشك ناکــەیت. تــۆ پێم بڵێ دەزانی ئێستاکە ئێمە بۆ کوێ دەچین؟"

لێنــی ســەرەتا پەشــۆکاوو سەرســام دەکــەوت و پاشــان لەشــەرم و تــەریقی دا دەموســــیمای خـــۆی لـــەپاڵ نەژنۆکانیـــدا شـــاردەوەو وتـــی: " دیـــسان لـــەبیرم چووەوە."

جــۆرجیش ناچــارانە وتــی: " ئــەی خــودای گــەورە، دەی باشــە، گــوێ ڕادێــرە، ئــەوا دەچـین کـار لەسـەر مەزرایەکـدا دەکـەین ڕێـك هاوچەشـنی ئـەو مەزرایـەی کـە لە باکووردا کارمان تێدا دەکرد."

"لە باکوور؟"

"ئا.. لە وید."

"ئۆو. بێگومان. هاتەوە بیرم. لە وید."

"ئــەو مەزرایــەی کــە بــۆی دەچــین ڕێــك ئــەو خــوارە دایــە، هــەر دەوروبــەری چــارەکە میلێــك دوور دەبێــت. دەچــینە ئــەوێ و ســەرکارەکە دەبیــنین. ئێــستاش بــاش گــوێم بــۆ شــلکە، مــن کارتــەکانی کارەکــەی دەدەمــێ، بــەڵام تــۆ ورتــە ناکــەیت. تــۆ لــەوێ ڕادەوەســتیت و نقەوجقــەت لێــوە نایــەت. ئەگــەر گــەلۆری و گێلــی تــۆی بــۆ دەر بکــەوێت ئــەوا ئیــشمان دەســتگیرنابێ، بــەڵام ئەگــەر بەرنــەوەی گوێبیــستی ناخاوتنــت بێــت ئــیش کردنەکەت ببینێ، ئەوا مسۆگەر دامەزراوو جێگیر بووینە. حاڵی بوویت؟"

"بێگومان، بێگومان جۆرج حاڵی بووم."

"کەواتە ئێستا پێم بڵێ چی دەکەیت کاتێ کە بۆبینینی سەرکارەکە دەچین؟"

"مــن... مــن" لێنــی کەوتــە تێهــزرین. تێهــزرین رووخــساری کــرژو مــۆن کردو وتی:

"من... هیچ نالێم. هەرئاوا ئالەوێ ڕادەوەستم."

"ئافەرین. ئەوە شتێکی بێ وێنەیە. دەتۆ دوو سێ جار ئەوە بڵێرەوە هەتا بێ سێ و دوو لەبیرت نەچێت."

لێنی بەنەرمی و ناسکییەکەوە خۆیەخۆ کەوتە بڵمەبلم: " هیچ شتێك ناڵێم... هیچ شتێك ناڵێم... هیچ شتێك ناڵێم."

جۆرج وتی: " دەی باشە. کەوابێ شتی بەدو خراپیش ناکەیت هەروەکو ئەوەی کەلە ویددا کردت."

لێنی بە حەپەساوییەکەوە وتی: " وەکو ئەوەی کە لە ویددا کردم؟"

"ئەها، کەواتە ئەوەیشت بیرچووە، ها؟ بەلاّم من ئەوەت بەبیردا ناهێنمەوە، نەترسی ئەوەی نەبا دووپاتی بکەیتەوە."

ترووسکایی تێگەیشتنێك لەسەر ڕووخساری لێنی دا دەرکەوت و بە ئۆخژنێکەوە وتی: " لە وید دەریان کردین،"

جۆرجیش بەجارِسیی و بێزارییەکەوە وتی: " ئەوە تۆ باسی دەرکردنی چی دەکەیت. ئێمە لەوێ هەلاّتین. ئەوان بەدواماندا دەگەڕان. بەلاّم دەستگیریان نەکردین."

لێنی دڵشادانە قریوەی هاتێ و گوتی: " بێگومان بە ئەوەم لەیاد نەچووە."

جۆرج لەسەر لەکەدا پاڵی لێ دایەوەو دەستەکانی یەکانگیرکردو نایە ژێر سەری، لێنیش چاوی لەوکرد، بۆ ئەوەیش کە بزانێ داخۆ بەڕاست و دروستی ئەوەی ئەنجام داوە یان نا سەری بەرزکردەوە. جۆرجیش پێی وت:

"ئای خودایە چەند کێشە و بەلاّیەکی گەورەیت. ئەگەر تۆ بەکلکمەوە نەبوویتایە، دەمتوانی زۆر بە جوانی و زۆر بەئاسانی هەڵبکەم. دەمتوانی زۆر بەخۆشی گوزەران بکەم و هەتا ڕەنگە دەزگیرانیشم هەبوایە."

لێنی چرکە ساتێك بەبێدەنگی لە جێگاکەی خۆیدا مایەوەو دواسا ئومێدوارانە وتی:

"جۆرج ئێمە بۆ ئەوە دەڕۆین کە لەسەر مەزراکەدا کاربکەین."

"زۆرباشە. ئا ئەوە حاڵی بوویت. بەلاّم ئالێرەدا بۆی دەنووین، چونکە وای بە باش دەزانم."

ئێستا ئیدی ڕۆژەکە بەلەز بەسەردەچوو. هەر تەنها لوتکەی شاخەکانی گابیلان بەتیشکی ئەو خۆرە دەدرەوشانەوە کە لە نشێوەکە دوورکەوتبووەوە. منارێکی ئاویی لەسەر ڕووی گۆماوەکەدا دەرکەوت و سەری وەکو پێریسکۆپێکی(١) خنجیلانە ڕێک ڕاگرت. لەنێو ڕەوتی ئاوەکەدا قامیشەکان تۆزقاڵێک جوولانەوە. لەو دوورایییەشەوە لەلای ڕێگا گشتییەکەوە پیاوێک شتێکی قیژاندو پیاوێکی تریش بەرسڤی قیژەکەی دایەوە. لق و پۆی چنارەکان بەهۆی هەلکردنی ئەو کزەبایەوە کەوتنە خشەخش کە هێندەی نەخایاند دامرکایەوە.

"جۆرج بۆچی ناچینە مەزراکە هەتا شێومان دەستبکەوێت؟ خۆ لە مەزراکەدا شێو هەیە."

جۆرج بەسەر لایەکەی تریدا وەرچەرخاو وتی: " بەهیچ شێوەیەک دەربەستی تۆ نایەم. من ئێرەم بە دڵە. سبەینێ دەچینە سەرکار. کاتێ کە بۆ ئێرە دەهاتین کۆمەڵە دەراسەیەکم دیت. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە سبەینێ گونیە دانەوێڵەکان هەڵدەگرین و ئەمەیش سپیەلاکمان دەردەکێشێ. ئەمشەو من ناڵێرەدا ڕادەکشێم و دەڕوانمە ئاسمان. من ئێرەم بە دڵە."

لێنی هەستایە سەرچۆکان و لە جۆرج ڕاماو وتی: " ئەی شێو ناکەین؟"

"ئەگەر تۆ هەندێک چڵوچێوو چیلکەی وشکەوە بووی دارەبی کۆبکەیتەوە و بیان هێنی، ئەوا بێگومان شێو دەکەین.سێ قتووە فاسۆلیا لەناو هەگبەکەم دایە. تۆ ئاگرێک خۆش بکەرەوە. کەچڵوچێوو چیلکەکانت کۆکردەوەو کەڵەکەت کردن ئەوسا من شقارتەت دەدەمێ. فاسۆلیاکان گەرم دەکەینەوەو شام دەخۆین."

لێنی وتی: " من حەزم لە فاسۆلیایە بەسۆسی کێچاپەوە."

"بەلام کێچاپ شک نابەین. تۆ بڕۆ چڵوچێوەکە بێنە. خۆیشت لەملاولەولا مەخلافێنە، چونکە هێندە نابات تاریک دادێت."

---

(١) Periscope : ئەو دووربینەیە کە لە غەوواسە و مەتەرێزەکاندا بەکار دەبرێت.

لێنـی بەسـەنگینی و خاوییەکـەوە کەوتەسـەر پێیـەکانی ولـەنێو بۆتەزارەکـەدا پێـوار بـوو. جـۆرج هـەر لـە جێگاکـەی خۆیـدا بـە ڕاکشاوی مایـەوەو بۆخـۆی بـە ئەسـپایی کەوتـە فیکـە لێـدان. دەنگـە دەنگـی شـلپ و هـوڕ لـەو ئاراسـتەیەوە دەهـات کـە لێنـی گرتبوویەبـەر. جـۆرج لـە فیکەلێـدان کـەوت و گـوێی هەڵخست. ئینجـا بـە هێمنییەکـەوە وتـی: " هـەی ناکـەس بەچـەی چـارەڕەش.." و پاشـان دووبارە دەستی کردەوەو بە فیکە لێدان.

ئـا لـەو ئانوسـاتەدا دەنگـی هـاڕەو وردو خاشـبوون بـەرزبووەوەو لێنـیش لەمابـەینی لێرەکانـەوە پەیـدا بـوو. هەرتـەنها یـەك چـڵەدارەبی بـچکۆلانەی لـە دەسـتدا هـەلگرتبوو. جـۆرج هەسـتاو دانیـشت و تەشـەرئامێزانە وتـی: " دەی باشە، ئەو مشکەم بدەرێ!"

بـەلام لێنـی کارامانـەو پێـچوپەنادارانە کەوتـە هێمـاو ئیـشارەکردنێکی ساویلکانەو وتی: " جۆرج مشکی چی ؟ من مشکم پێ نییە."

جـۆرج دەسـتی خـۆی ڕاگـرت و وتـی: " دەی بـدەرێ. نـاتوانی فرتـوفێڵم لێبکەیت."

لێنـیش هەڵوەسـتەیەکی بـۆ کـردو گەڕایـە دواوە، ئینجـا بەهەڵەشـەییەکەوە چـاوی بڕییـە ئاقـاری بێـشەلانەکە وەك بلێـی بـۆ دەربـازبوونی خـۆی بەتـەمای ڕاکـردن بێـت. بـەلام جـۆرج بـە ساردوسـڕییەکەوە وتـی: " ئـەو مـشکەم دەدەیتـێ یان مستە کۆلەیەکی چاکت تێسرەوێنم؟"

"چیت بدەمێ جۆرج؟"

"زۆر بە چاکی دەزانیت چیم مەبەستە. ئەو مشکەم دەوێ."

لێنـی بـەبێ مەیلییەکـەوە دەسـتی خـۆی ئاخنییـە گیرفانییـەوە. بـە دەنگێکـی کـەمێك زەلیـل و شـکاوەوە وتـی: " نـازانم بۆچـی بـۆم نییـە ڕایبگـرم. خـۆ مـشکی هـیچ کەسـێك نییـە و نەشـم دزیـووە. کـە دۆزیـمەوە ڕێـك لەتەنیـشت ڕێگاکـەدا کەوتبوو."

دەستی جۆرج هەروا پەیگیرانە بەراگیراوی و درێژکراوی مایەوە. لێنی هێدی هێدی، وەکو ئەو سەگە تێریەرەی کە نایەوێ بۆ ساحێبەکەی تۆپەکە بگێڕێتەوە، هاتە پێشەوەو نەختێك چووە دواوەو جارێکی تر هاتەوە پێشێ.

جۆرج توندوتیژانە بەقامکەکانی خۆی چەقەنەی لێداو بەهۆی دەنگی چەقەنەکەوە لێنی مشکەکەی لەنێو دەستیدا داناو وتی:

"خۆ هیچ شتێکی خراپم لەگەڵدا نەدەکرد جۆرج. هەرتەنها دەستم پیادا دەهێنا و نەوازشم دەکرد."

جۆرج هەستاو هەتا توانی مشکەکەی تووڕهەڵدایە نێو بۆتەزارە نوتەك هەڵگەڕاوە کە، ئەوسا بەرەو لای گۆلاوەکە ڕۆیشت و دەستەکانی شوشت و وتی:

"هەی گەمژەی شڕوشێت. ئایا پێت وابوو کەمن پێیە تەڕەکانت نابینم کاتێ کە چوویتە ئەوبەری ڕووبارەکە تا مشکەکە بهێنیتەوە؟" بەلاَم کە گوێی لە گریەو فینگەفینگ و سوورانەوەی لێنی بوو وتی: "تەماشا وەك ساوایەك دەگریەت و هەنسك دەدات! ئەی خودای گەورە! زەلامێکی زل و زەبەلاحی وەکو تۆ." لێنیش لێوە لەرزەی پێکەوت و ئەشك لە چاوەکانیدا سەریانهەڵدا.

"ئۆو، لێنی!" جۆرج ئەمەی وت و دەستی لە سەرشانی لێنیدا دانا و ئینجا وتی: "من هەر لە پێناوی دڵڕەقی کردن نییە کە نیێتی دەسەنم لێنی، چونکە ئەم مشکە زیندوو نییەو سەرباری ئەوەیش هێندەت نەوازش کردووە تێکت شکاندووە. مشکێکی دیکە بێنە، مشکێك کە زیندوو بێت و ئەوسا منیش دەهێڵم بۆماوەیەکی کورت بەخێوی بکەیت و رایبگریت."

لێنی لەسەر عەرزەکەدا دانیشت و غەمگینانە سەری خۆی نەوی کردەوەو وتی: "نازانم لەکوێ مشکی تر هەیە. ئەو ژنەم دێتەوە یاد کەبەردەوام مشکەکانی خۆی بەمن دەبەخشێ، هەموو ئەو مشکانەی کە هەیبوو بە منی دەبەخشی. بەلاَم ئەو ژنە ئێستاکە لێرانە نییە."

جـۆرج کەوتــە ڕیـشخەندکردن و وتــی: " ژن، هــا؟ ئــەی نایەتــەوە بـیرت ئــەو ژنــە کــێ بــوو؟ ئــەوە پــووره کـلارای خـۆت بـوو. ئـیتر دوای ئـەوە ڕایگـرت و بـەتۆی نەدەدا، چونکە تۆ هەمیشە دەتکوشتن."

لێنـی غـەمگینانــە تێبڕوانــی و پۆزشــنامێزانە وتــی: " ئەمەنــدە بــچکۆلانە بــوون، هــەر کــە نەوازشـم دەکـردن زۆری نــەدەبرد تلییــەکانیان دەگەسـتم و منـیش نقورچـێکی بـچووکم لەسـەریان دەگـرت و پاشـان ئـیتر دەمـردن، دەمـردن چـونکە زۆر بــچکۆلانە بــوون. جــۆرج مــن ئاواتــەخوازی ئــەوەم کــە زوو بــە زوو کەروێشکەکان بهێنین. ئەوانە هێندە بچووك نین."

"ئێـستا واز لــە کەروێـشکەکان بێنــە. بـەڵام تـۆ نـابێ هـیچ لەگـەڵ مـشکی زینــدوودا بـڕوات پێبکــرێ. پــووره کــلارات مــشکێکی لاســتیکی دابــوویتی و نەتدەتوانی هیچ شتێکی لێ بکەیت."

لێنیش وتی: " نەودانەیە بۆ نەوازش کردن باش نەبوو."

درەوشـەی خۆرنـشین لەسـەر ترۆپکـی شـاخەکاندا ڕەوییـەوە و گورگـومێش نێـو دۆڵەکـەی داگرتــەوەو نیمـچە تاریکییــەکیش نابــەینی شـۆڕەبییەکان و چـنارەکانی داگرتــەوە. سـووره ماسـییەکی گــەوره هاتــە سـەر ڕووگــەی گۆمەکــە، نــەختێك هــەوای هەڵلووشــی و نەســرارنامێزانە لــەنێو ئــاوه تاریــك و نوتەکەکــەدا نقــووم بــووەوەو چــەرده نەڵقــەو بازنەیــەکی بلاوبــووەوەی نەســـەر ڕووی ناوەکـــەدا هێـشتەوە. لــە سەرەوەیـشدا گــەڵاکان دیــسان جووڵەیــەکی تونــدوتۆڵیان کــردو هەنـدێ ورده لۆکـەی شـیکراوەی پڤکـردوو بـا خـستییە خـوارەوە و لەسـەر ڕووی گۆماوەکەدا گیرسانەوە.

جـۆرج لێیپرســی و وتــی: " ئــەی ئــەو چـیلکەو چڵوچـێوه ناهێنیـت؟ ڕێـك ڕووبــەڕووی پـشتەوەی ئــەو دار چـناره پــووش و پەلاشــێکی زۆر هەیــە. دار و چیلکەو چێوی لافاو ڕاداو هەیە، دەی برۆ بیهێنە."

لێنــی ڕۆیــشتە ئــەو دیــوو دارەکــەوەو کەڵەکــە گــەڵاو چڵوچــێوێکی وشــکەوە بــووی هێنــاو هــەر ئاوهــا بــە کەڵەکــەیی فڕێیدایــە ســەر کەڵەکــەی خۆڵەمێــشە کەوناراکـەو چـووەوە بـۆ ئـەوەی هینـی تـریش بێنـێ. ئێـستاکە ئـیتر تەقریبـەن شـەو داهــاتبوو. باڵــەکانی قومرییــەکیش بەســەر ئاوەکــەدا فڕەفڕیــان دەهــات. جــۆرج چــووە لای کەڵەکـــەی چڵوچـــێوەکان و گـــەڵا وشـــکەکانی هەڵایـــسان. گڕەکــە قرچەقرچــی خــستە نێــو چــڵەکانەوەو کەوتنــە جــۆش وخــرۆش. جــۆرج بارگەکــەی خـــۆی ئـــاوەڵا کـــردەوەو ســـێ قتـــووە فاســـۆلیای لێ هێنایـــە دەرەوە و لـــەپاڵ ئاگرەکـەدا ڕایگـرتن، تـەنراو بـە بلێـسەی ئاگرەکـە ڕایگـرتن. وەلێ ئەوەنـدە نـا کـە بەر ئاگرەکە بکەون.

جۆرج وتی: " ئەم فاسۆلیایە بەشی چوار پیاو دەکات."

لێنی کە لە سەرەوەی ئاگرەکەوە تەماشای ئەوی دەکرد بوردەبارانە وتی:

"من بە کێچاپەوە حەزم لێیە."

جـۆرجیش بەیـەکجاریی گـڕی گـرت و بەشـێتگیرییەوە وتـی: " ئـێ چـیبکەین کێـچاپمان نییـە. هەرچییەکیش کـە ئێمـە نیمانـە تـۆ ئـا ئـەوەت دەوێ. هـەی خـوای گـەورە، ئەگـەر تـاق و تـەنها بوومایـە دەمتـوانی بـە خۆشـگوزەرانی بۆخـۆم بـژیم. دەمتــوانی بــڕۆم ئیــشێك بەدەســت بهێــنم و بــێ گیروگــاز و ســەر ئێــشە کاربکــەم. بەبێ هـیچ تـەنگو چـەڵەمەیەك کـارم دەکـردو کـاتێکیش کـە سـەری مـانگ دەهـات پـــەنجا دۆلارەکـــەی خـــۆمم وەردەگـــرت و دەچـــوومە نێـــو شـــارو هەرچـــییەکم بویـــستبایە دەمکـــڕی. ئـــا، هـــەروەها دەمتـــوانی شـــەوێکی تـــەواویش لـــە ماڵـــە ســـۆزانییەکدا بەســـەربەرم. لەهـــەر شـــوێنێکیش کـــە ئـــارەزووم بکردبایـــە ئـــیتر ئوتێـــل بووایــە یــاخود هــەر جێگایــەکی تــر، هەرچــی شــتێك کــە بــیرم لێ بکردبایەتــەوە پــەیجۆرم دەکــردو ئــانی خــۆمم دەخــوارد. دەیــشمتوانی هــەموو ســەری مانگانێــك تــا ئەو شتانە ئـەنجام بـدەم. گالۆنێـك ویـسکی بکـڕم، یـان بـچمە یانـەی بلیـارد کـردن و یــاری کاغــەز یــاخود یــاری بلیــاردی تێــدا بکــەم." لێنــی کەوتــە ســەر چــۆك و

لەســـەرووی ئاگرەکـــەوە تەماشـــای جـــۆرجی تـــوورەو عەبووســـی دەکـــرد و دەموچاویشی ترس و سامی بەسەردا هەڵنیشتبوو.

جـۆرج زۆر بـە شـێتگیرییەوە لەسـەر قـسەکەی خـۆی رۆیـشت و وتـی: " ئـەی چیم پـێ براوە، تـۆم پێبراوە! تـۆیش دەسـەڵاتی پاراستنی ئیشێکت نییەو هەرچی ئیشێکیـشم دەسـت دەکـەوێت تـۆ لـە کیـسی منـی دەدەیـت. هـەر تـەنها ئـەوەت لەدەسـت دێـت کـە هەمیـشە بەسـەرنەبەری ناوچـەکەدا گەڕێـدەم بکـەیت. هەرتـەنها ئـەو ناپەسـەندییەش نییـە، بـەڵکو دەکەویتـە گێرمەوکێـشەوەو شـتێکی خـراپ دەکـەیت و هـەر منـیش دەبـێ رزگـارت بکـەم." دەنگـی ئـیتر ببـووە قیـژە قیـژو شیتەشـیت. "هـەی کـوڕم قەحپـەی شڕوشـێت. تـۆ هەمیـشە مـن دەخەیتـە ناخۆشـی و تەنگوچـەڵەمەوە." ئینجـا لێنـی ڕەفتـاری بەمـەکرو کروشمـەی ئـەو کـچە بـچکۆلانانەی گرتـەخۆ کـە دەمەلاسـکێی یـەکتری دەکەنـەوەو وتـی: " هـەر تـەنها حـەزم دەکـرد دەسـت بەکراسـی ئـەو کـچەدا بهێـنم، هـەر تـەنها دەمویـست نەوازشیی بکەم وەکو ئەوەی مشکێك بێت."

"ئێ، ئـەی چـۆن چـۆنی ئـەو کـچە دەبوایـە بزانـێ کـە تـۆ هـەر تـەنها دەتویـست دەسـت لـە کراسـەکەی بـدەیت؟ ئـەو لەترسـا کـەوتبووە پەلـەقاژێ و تـۆیش بـەزەبرتر گرتبـووت وەکـو ئـەوەی مـشکێك بێـت. ئـەو کردبوویـە قیـژە قیـژو چـەردەیەك پیـاویش بەدوامانـدا دەگـەڕان و ئێمـەیش ئـەتاوا رۆژێکـی ڕەبـەق خۆمـان لـە خەنـەقی نـاودێریی کردنـدا حەشـارداو دەبووایـە لـە کـاتی تاریکیـدا پێـدزە بکـەین و دەربـازبین و لـەو ناوایـە وەدەرکـەوین. هـەردەم، هـەردەم شـتێکی ئالـەو بابەتـەت ئـەنجام دەدا. بریـا بمتوانیبایـە لەگـەڵ نزیکـەی یـەك ملیـۆن مـشکدا بتناخنمە نێو قەفەزەوەو لێتگەڕێم کەیف بکەیت."

لـەپڕێکا توورەییەکـەی جـۆرج ڕەوییـەوە. لەوبـەری ئاگرەکـەوە سـەیری چروچـاوە غـەمبار و پەژاراوییەکـەی لێنـی کـردو ئـەودەم خەجاڵەتبارانـە چـاوی بڕییە گڕوبڵێسەی ئاگرەکە.

ئەگەرچی ئیتر دونیا گەلێك تاریك هەڵگەڕابوو، بەڵام ئاگرەكە قەدی درەختەكان و لق و چڵە كووڕو كەوانەییەكانی سەرەوەیانی ڕووناك دەكردەوە. لێنی بەدیقەت و هێواشییەكەوە بە دەوری ئاگرەكە بە خۆ خشاندن ڕۆیشت هەتا لە جۆرج نزیك كەوتەوەو لەسەر پاژنەكانیدا چیچكەی كرد. جۆرج قتووە فاسۆلیاكانی وەرسووڕاندەوە هەتاكو لایەكانی تری قتووەكان ڕوویان لە ئاگرەكە كرد. وایشی دەرخست كە خافڵ و بێئاگا بێ لەوەی كە لێنی ئەمەندە نزیكە لێیەوە.

لێنی زۆر بەناسكییەوە وتی: " جۆرج، " بەڵام كە وەرام نەبوو دووبارە وتییەوە: "جۆرج!"

"چیت دەوێت؟"

"جۆرج من بە گاڵتەم بوو، كێچاپم ناوێ. ئەگەر ڕێكیش تا ئێستاكە لێرە لە تەنیشتم دا بوایە نەمدەخوارد."

"ئەگەر لێرە هەبوایە، بۆ خۆت دەتتوانی هەندێكی لێ بخۆیت."

"بەڵام هیچم لێ نەدەخوارد جۆرج. بۆ تۆ لە هەمووی دەگەڕام. تا بەسەر فاسۆلیاكەی خۆتدا بڵاوی بكەیتەوە، منیش دەستم نە هیچییەوە نەدەدا."

جۆرجیش هێشتاكە هەر عەبووسانە لە ئاگرەكە ڕامابوو: " كاتێ كە بیر لەو وەختە نایابە دەكەمەوە كە دەمتوانی بەبێ تۆ بەسەری بەرم، تێكدەچم. بۆیە هەرگیزیش ئاسوودە نابم."

لێنی هێشتا هەر چۆكداداو چاوی بڕیبووە نێو تاریكی ئەو دیووی ڕووبارەكە.

"جۆرج ئەگەر دەتەوێ دەڕۆم و بەجێت دەهێڵم... تاق و تەنیا بەجێت دەهێڵم."

"بۆ كوێ دەتوانی بڕۆیت؟"

"ها، دەتوانم بڕۆم.. دەتوانم بۆ نێو ئەو زوورگانەی ئەوێ بڕۆم. لە جێگایەكیش دا ئەشكەوتێك هەر پەیدا دەكەم."

"ئـێ؟ ئـەی چـۆن خـواردن دەخۆیـت؟ خـۆ هێنـدەیش نـاوەز شـکنابەیت تـا بـۆ خواردن شتێك پەیدا بکەیت."

"جـۆرج شـتگەلێك هـەر دەدۆزمـەوە. پێداویـستیم بـە خـۆراکی خـۆش نییـە بەکێـچاپەوە. لەبەرهـەتاودا ڕادەکـشێم و هـیچ کەسـێکیش عەزیـەتم نـادات. ئەگـەر مشکێکیـشم دیتـەوە، ئـەوا دەتـوانم ڕایگـرم. هـیچ کەسـێکیش لێمـی ناستێنێ."

جـۆرج بـەخێرایی و سـۆراخکارانە تەماشـای کـردو وتـی: " بـەرخراپ بـووم لەگەڵتا وانییە؟"

"ئەگـەر منـت نـاوێ ئـەوا دەچـمە نێـو ئـەو زوورگانـە و ئەشـکەوتێك دەدۆزمەوە. هەرکاتێك بێت دەتوانم بڕۆم."

"نـا، نـا، گـوێبگرە! لێنـی مـن گاڵتـەم دەکـرد. چـونکە دەمـەوێ تـۆ لەگـەڵما بمێنیتـەوە. کێـشەو گرفتـی تـۆ لەگـەڵ مـشکا ئەوەیـە کـە تـۆ بـەردەوام دەیانکوژیت."

هەڵوەسـتەیەکی بـۆکردو وتـی: " بـا پێـت بڵـێم چـی دەکـەم لێنـی. یەکـەمین هـەلێ بـۆ هەڵکـەوێت توتەڵـە سـەگێکت دەدەمـێ. لەوانەیـە نـەیکوژیت. ئـەوە لـە مشك باشترە و دەیشتوانی زیاترو قایمتر نەوازشی بکەیت."

لێنی ئەو دەسـتخەڕۆ کردنـە خـودداری کـردو پـەی بـەوەیش بـرد کـە لـە بـارێکی لەبارتردایە بۆیە وتی:

"ئەگـەر منـت نـاوێ بـە ناشـکرایی پـێم بڵـێ، منـیش دەچـمە نێـو ئـەو زوورگانـەی نـا ئـەوێ، ڕێـك دەچـمە سـەر ئـەو زوورگانـەو بـە تـەنهایی دەژیـم و ناهێڵم مشکم لێ بدزرێت."

جۆرج وتـی: " لێنـی مـن دەمـەوێ تـۆ لەگەڵمـدا بمێنیتـەوە. خـوای گـەورە، ئەترسـم یـەکێك تەقـەت لێبکـات و وابزانێـت گیانـداری کۆیـۆتی ئەگـەر هـەر خـۆت تـاق و تـەنیا

بیت. نا.. نا.. تۆ لەگەڵ مندا دەمێنیتەوە. پوورە کلارات ئەوەی بەدڵ نابێت کە تۆ بەتەنیا هەڵبێیت و بڕۆیت، هەتا ئەگەر ئێستا کۆچی دوایشی کردبێت."

لێنی بە زۆرزانییەکەوە وتی: " باسم بۆ بکە، وەکو چۆن پێشتر بۆت باس کردووم."

"چیت بۆ باس بکەم؟"

باسی کەروێشکەکانم بۆ بکە."

جۆرجیش بە شێتگیرییەکەوە وتی: " هەوڵ مەدە، چونکە ناتوانی بەهیچ شتێك هەڵمبخەڵەتێنی."

لێنی پاڕایەوە و وتی: " دەی جۆرج. بۆم بگێڕەوە. تکات لێ دەکەم جۆرج. هەروەکو چۆن پێشتر بۆت گێڕاومەتەوە."

" بەوە خۆشحاڵ و بەکەیف دەبی، ها؟ دەی باشە بۆت دەگێڕمەوە و ئەوسا شێوەکەمان دەخۆین."

دەنگی جۆرج نەرم بووەوەو قووڵتر هەڵگەڕا. وشەکانی بەشێوەیەکی گونجاوو هەماهەنگدار دووبارە کردنەوە وەك بڵێی پێشتر چەندین جار ئەو وشانەی دووپات کردبێتەوە.

"ئەو کەسانەی وەك ئێمەن و لەمەزرادا کاردەکەن، بێکەسترین و تەنیاترین کەسانێکن لەدنیادا و هیچ کەس و خانەوادەیەکیان نییەولەهیچ شوێنێکیشدا دەرەتان و داڵدەیان نییە. بۆیە دێنە مەزرایەك و پارەیەك پەیدا دەکەن و ئینجا کە دەچنە شارو پارەکەیان بەبا دەدەن، دەستبەجێ دەزانیت کە ئەوانە ئیتر دەبێ پەیتا پەیتا کلکی خۆیان لەسەر مەزرایەکی تردا پێماڵ بکەن. چونکە هیچ شتێکیان نییە تا بۆ ئایندە لێبکەنەوە."

لێنی بەوە زۆر گەشایەوەو بە خۆشحاڵییەوە وتی: " ڕێك وایە، ڕێك ئا ئەوەیە. ئێستاش پێم بڵێ لەگەڵ ئێمەدا چۆن چۆنییە؟"

جۆرج بەردەوام بوو: " لەگەڵ ئێمەدا بەو جۆرە نییە. ئێمە هیواو ئاواتمان هەیە. ئێمە کەسێکمان هەیە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکەین و بایەخمان پێدەدات. مەرج نییە لە مەیخانەیەکدا دانیشین و دەرامەتەکەی خۆمان بە با بدەین هەر تەنها لەبەرئەوەی کەجێگایەکی ترمان نییە بۆی بڕۆین. ئەگەر ئەو زەلامانەی تر بکەونە بەندیخانەشەوە دەبا کرمە ڕێزبن چونکە کەس دەربەستیان نایەت. بەلاّم ئێمە وانین."

لێنی خۆی تێ هەڵقورتاند و وتی: " ئێمە وانین! بەلاّم بۆچی ئێمە وانین؟ چونکە... چونکە من تۆم هەیت بۆ ئەوەی ئاگات لێم بێت و تۆیش منت هەم بۆ ئەوەی بە تەنگتەوە بێم، بۆیە ئێمە وانین." بە شادخاڵییەکەوە پێکەنی و وتی: " ئێستاش بەردەوامبە جۆرج!"

"تۆ ئیتر بە ئەبەر دەیزانیت و خۆت دەتوانی بیلێیت."

"نا، نا. تۆ خۆت دەبێ بدوێیت. چونکە من هەمیشە هەندێك لە شتەکانم بیردەچێت. تۆ لەبارەی ئەوەوە بدوێ کە چۆن دەبین و چی دەکەین؟"

"دەی باشە. ڕۆژێك لە ڕۆژان دەرامەتەکەمان کۆدەکەینەوەو خانوویەکی چکۆلانەو دوو ئەیکەر زەوی دەکڕین و مانگایەك و چەند دانە بەرازێك و..."

لێنیش بەسەرو سەدایەکەوە وتی: " بەخێرو بێری زەوییەکەیش ئاسوودە دەژێین و کەروێشکیش ڕادەگرین. توخوا بەردەوامبە جۆرج! سەبارەت ئەوە بدوێ کە لە باخچەکەدا چیمان دەبێ، لەبارەی ئەو کەروێشکانەی نێو قەفەزەکان و بارانی بارینی زستان و کوچکاوەرەکەمانەوە بدوێ، لەبارەی ئەوەی کە سەرتوێژی شیرەکە چەند ئەستووردەبێ و وەك بڵێیت زۆر بە زەحمەت بتوانی بیبڕیت. لەبارەی ئەوانەوە بدوێ جۆرج."

"ئەی تۆ خۆت بۆ باسی ناکەیت؟ خۆ تۆ هەرهەمووی دەزانیت."

"نا.. نا.. تۆ بیلێ. ئەگەر من بیلێم هەمان تاموچێژی نییە. دەیەڵلاّ بەردەوام بە جۆرج. ئەوە بڵێ کە چۆن بە تەنگ کەروێشکەکانەوە دێم."

"ده باشـه دەی، " جـۆرج وتـی: " کەشـتزارێکی گـەورەی سـەوزەواتمان دەبـێ و کولانەیـەك بـۆ کەروێـشکەکان و کۆمەڵـە مریـشکێك، کاتێـك کـە لـە زستانیـشدا بـاران دەبارێـت، بـەخۆمان دەڵـێین چـوونە سـەر ئـیش و کـارکردن بەجەهەننـەم و ئـاگرێکی چـاك لـەنێو کووانووەکـەدا دەکەینـەوەو لـە زێواریـدا دادەنیـشین و گـوێ بـۆ ئـەو بارانـە شـل دەکـەین کـە بەسـەر سـەربانەکەدا دێتـە خـوارەوەو تـا ئەوپـەڕی شـادمەند دەبـین." ئینجـا دوایـی چـەقۆکەی لـە گیرفـانی دەرهێناو وتی:

"وەختـی پـترم نییـە قـسەت بـۆ بکـەم." چـەقۆکەی لەسـەرەوەی یـەکێك لـە قتـووە فاسـۆلیاکانەوە فروبـردو هـەڵی پـچڕی و قتووەکـەی دایـە دەسـت لێنـی. ئەوسـا قتوویـەکی دیکـەی هەڵپـچڕی. لـە گیرفـانێکی تەنیـشتییەوە دوو کەوچـکی هێنایـە دەرەوە و یـەکێکیانی دایـە دەسـت لێنـی. ئەوسـا لەتەنیـشت ئاگرەکـەدا دانیـشتن و دەمیـان لـە فاسـۆلیا سـیخناخ کـردو بـەگوڕ تینـەوە کەوتنـە جـووینی.چـەند دەنکـە فاسـۆلیایەك لـە زاری لێنییـەوە دەرپەڕیـە دەرەوە. جـۆرجیش بـە کەوچـکەکەی خـۆی ئیـشارەتی بـۆ لای زاری کـردو وتـی: " سـبەینێ ئەگەر سەرکارەکە پرسیارت لێبکات چی وەڵام دەدەیتەوە؟"

لێنـی لـە جـووین کـەوت و ئـەوەی لـە دەمیـدا بـوو قـووتی دا. شـپرزەیی و سەغڵەتیی بە ڕووخسارییەوە دەرکەوت و وتی: " من... من هیچ شتێك... نازانم."

"ئافـەرین! زۆر باشـە لێنـی! خەریکـە لـە جـاران چـاکتر دەبیـت. کەواتـە کـاتێ کـە ئـەو دوو ئەیکـەرە زەوییـەمان کـڕی ئـەوا ڕێـت پـێ دەدەم کەروێـشکەکان بەخێوبکەیت. بەتایبەتیش ئەگەر ئاوا بە چاکی شتەکانت وەبیر بێتەوە."

لێنیش کە شانازی تاساندبووی وتی: " ئەوانەیە بێتەوە بیرم."

جـۆرج دووبـارە بـە کەوچـکەکەی خـۆی نیـشارەتی بـۆ کـردەوەو وتـی: " دەگـوێ بگـرە لێنـی. دەمـەوێ چـاك تەماشـای ئـەم دەوروبـەرە بکـەیت. بێگومـان دەتـوانی

ئـا ئـەم جێگایـە بهێنیتـەوە بـیر، نـاتوانی؟ مەزراکـە دەوروبـەری چـارەکە میلێـك لەسەرەوەی ئەم ڕێگایەدایە. هەرتەنها دوای رووبارەکە بکەوە دەگەیتە ئێرە."

لێنـیش وتـی: " بـە دڵنیاییـەوە، ئـەم شـوێنەم لـەبیردەمێنێ. ئـەی ئـەوەم نەکەوتەوە بیر کە هیچ شتێك نەڵێم؟"

"بێگومـان کەوتـەوە بـیرت. دەباشـە گـوێبگرە لێنـی. ئەگـەر وا ڕێکـەوت و هـەر وەکـو جارەکـانی پێـشوو کەوتیتـە نێـو ناریـشەو گرفتـەوە، ئـەوا دەمـەوێ یەکڕاست بێیتە ئێرەو لەنێو لێرەکاندا خۆت حەشار بدەیت."

لێنی بە ئەسپایی وتی: " خۆم لەنێو لێرەکاندا حەشار دەدەم."

"تا هەتا مـن دێـم بـۆ لات خـۆت لـە نێـو لێرەکانـدا حەشـار بـدە. ئایـا دەتـوانی ئا ئەمە لە بیر نەکەیت؟"

"بێگومـان ئـەوەم پـێ دەکـرێ جـۆرج. هـەتاکو تـۆ دێیـت خـۆم لـەنێو لێرەکانـدا حەشار بدەم."

"بـەلام هەوڵبـدە نەکەویتـە نێـو هـیچ کێـشەوگرفتێکەوە، چـونکە ئەگـەر بکەویتـە نـاو کێـشەو بـەرەوە، نـاهێڵم کەروێـشك بـەخێو بکـەیت." قتـووی بـەتاڵی فاسۆلیاکەی دوور دوور هەڵداو هاویشتییە نێو ئێرەکان.

"جـۆرج خـۆم ناخەمـە نێـو هـیچ کێشمەکێـشێکەوە و ورتـەم لێـوە نایـەت و هیچیش ناڵێم."

"دە باشـە کۆڵـە پـشتەکەت بێنـە ئێـرە، بیهێنـە تەنیـشت ئاگرەکـەوە. خـەوتن لێـرەدا شـتێکی خـۆش و نایابـە. بـۆ خۆمـان تەماشـای ئاسمـان و گـەلاکانیش دەکەین. ئاگری دیکە خۆش مەکە. لێیدەگەڕێین ڕوومرێت و دامرکێتەوە."

وەتاغـەکانیان لەسـەر لمەکـەدا ڕاخـست، لەگـەڵ نیـشتنەوە و دامردنـەوەی بڵێـسەی ئاگرەکەیـشدا قەڵـەمڕەوی رووناکییەکـە بـچووکتر هەڵگـەڕا، لـق و چـڵە پێـچولوولەکان دیارنـەمان و هەرتـەنها نـوورێکی کـەمتین نـەو شـوێنەدا بەدیارکـەوت کـە قـەدی درەختەکانی لێبوو. لە نوتەکییەکەوە لێنی هاواری کرد:

"جۆرج خەوتوویتە؟"

"نا. چیت دەوێ؟"

"جۆرج باکەروێشکی هەمەڕەنگ ڕاگرین."

جۆرج خەواڵووانە وتی: " بێگومان کەروێشکی سووروشین و کەسکمان دەبێت لێنی. ملیۆنەهای وەکو ئەوانەمان دەبێت."

"جۆرج فەرووداڕەکانمان دەبێت، وەکو ئەوەی کە لە بازاڕ و جێژنەوارەی ساکرە مێنتۆدا بینوومە."

"بێگومان، فەرووداڕەکانمان دەبێت."

"جۆرج، چونکە ئەگەر وانەبێ ئەوا دەڕۆم و لە ئەشکەوتێکدا دەژیم."

جۆرجیش وتی: " دەتوانی بڕۆی بۆ جەهەننەم. دەبەسە ئیتر دەمت داخە."

ڕووناکییە سوورەکە لەسەر ڕووی خەنوزەکاندا پەژموردە و کز ببووەوە. لەسەرووی گردەکەی لای ڕووبارەکەوە کۆیۆتێك نوورەلووری دەهات و سەگێکیش لەوبەری جۆگەلەکەوە بەرپەرچی دەدایەوە. گەڵای دارچنارەکانیش لەنێو شنەبایەکی کزی شەودا کەوتنە سرتەو خشەخش.

* * *

خانووی جێ خەوی کارگەرەکان بینایەیەکی درێژکۆڵەی لاکێشەیی بوو. لە دیووی ناوەوەدا، دیوارەکانی گەچکاری کرابوون و عەرزەکەشی بێ ڕتووش و بۆیە نەکراوبوو. لە سێ دانە دیواریدا پەنجەرەی چوارگۆشەی بچکۆلانە هەبوو، لە دیوارەکەی چوارەمیشیدا،دەرگایەکی پتەوو روختەی تێدابوو کە بە کلۆمێکی تەختەیی دادەخرا. هەشت چەرپایەی تەسك و باریك بەقەد دیوارەکانەوە بوو، پێنج دانەیان بەتانییان لەسەردا ڕاخرابوو سێ دانەکەی

تریش بەرگە رووکێشی گۆشەکەیان بە دەرەوە بوو. لەسەر هەرچەرپایەیەکیشدا سنووقە سێوێکی بەتاڵ بە دیوارەکەدا داکوترا بوو، لایە کراوەکەی ڕوو لە دەرەوە بوو بەو شێوەیەیش دوو دانە ڕەفەی بۆ شتومەکی تایبەتمەندی ئەو کەسە دروست کردبوو کە سەرنشینی چەرپایەکە بوو. ئەم ڕەفانەیش لێوانلێو کرابوون لە وردە کاڵاو شتومەکی وەکو سابوون و پۆدرە و گوێزان و مەکینەی تراش و کۆمەڵێك لەو گۆڤارانەی " وێستێرن" کە کارگەرانی مەزراکان حەزیان دەکرد بیخوێننەوە و مەزاقی پێ بکەن و بەڵام وەکی تر ژێرەکییانە زۆر ڕایان لێبوو. هەروەها داودەرمان و کەمۆنەی بچکۆلەو کۆمەڵێك شانەیش لەسەر ڕەفەکاندا هەبوو، هەروەها بەو بزمارانەشەوە کەبەملاولای سنووقەکانەوە داکوترا بوون چەند دانە بۆینباخێك هەڵواسرابوو. لە نزیك یەکێك لە دیوارەکانەوە ئۆجاخێکی ڕەشی لە ئاسنی حەوجۆش دروست کراو دانرابوو لوولەی دووکەڵ کێشەکەیشی ڕێك لە میچەکەوە دەچووە دەرەوە. لەناوەندی ژوورەکەدا مێزێکی گەورەی چوارگۆشە دانرا بوو کە کاغەزی یاری بەسەردا پەرشوبلاو کرابووەوەو لە دەوروبەریشیدا چەردە سنووقێك هەبوو بۆ ئەوەی یاریکەرەکان لەسەریدا ڕۆبنیشن.

لەدەوروبەری کاتژمێر دەی بەیانیدا هەتاو لەمیانەی یەکێك لە پەنجەرەکانی لاتەنیشتەوە چەپکە تیشکێکی تەپوتۆز هەڵگری روونـاکی ناردە ژوورەوەو کۆمەڵێك مێش و مەگەزیش وەکو ئەستێرە کشاوەکان خێرا خێرا دەهاتنە نێو درەوشانەوەی تیشکەکان و دووبارە دەردەچوونەوە.

کلۆمە دارینەکە بەرزکرایەوەو دەرگاکە ئاوەڵا بووەوە، پیاوێکی باڵابەرزو شان داچەکاوی بەساڵداچوو وەژوورکەوت.جلوبەرگی شینی جینزی پۆشیبوو و گسکێکی گەورەشی لەدەستی چەپیدا هەڵگرتبوو. لەدوای ئەوەوە جۆرج و لەدوای جۆرجیشەوە لێنی هاتە ژوورەوە.

پیرەمێردەکە وتی: " سەرکارەکە دوێنێ شەو چاوەڕێی هاتنتان بوو، ئەم بەیانییەیش دۆزەخ ئاسا دەهەری و شێتگیربوو کە ئێوە لێرە نەبوون بۆ ئەوەی بچنە سەرکار. دەستی ڕاستی درێژکردو لە ئاستینەکەی تریشییەوە مەچەکێکی گردی خڕیلەی تێلاناسای بێ دەست هاتە دەرەوە.
"دەتوانن ئالەو دوو وەتاغەی ئەوێدا بۆ خۆتان بخەون."
ئەمەی وت و نیشارەتی بۆ ئەو دوو چەرپایەیەی تەنیشت نۆجاغەکە کرد.
جۆرج چووە لای چەرپایەکەوەو بەتانییەکانی خۆی هاویشتە سەر ئەو گونیە گوشییە پڕ لە کایەی کە لە بریتی دۆشەگ دانرا بوو. ڕووانییە نێو سنووقە ڕەفییەکەی خۆی و قتوویەکی زەردیلەی بچووکی لێوە قۆزتەوەو وتی:
" پێم بڵێ، ئا ئەم شتە چییە؟"
پیرەمێردەکەیش وتی: " نازانم."
"لەسەری نووسراوە کە ئێبراوانە ئەسپێ و سرسرو ئافاتەکانی تر قەلاچۆ دەکات. بەهەر حاڵ، ئەمە چ جۆرە وەتاغێکە کە ئێوە بە ئێمەی دەدەن. ئێمە کەروێشکی نێو پانتۆڵ و دەرپێمان ناوێت."
کرێکارە بەساڵدا چووەکە ئەو کاتەی کە دەستی بۆ قتووەکە درێژکرد گسکەکەی بۆ دەستەکەی تری گواستەوەو لەمابەینی ئانیشك و تەنیشتەکانیدا گرتی. بە لەسەرخۆیی و دیقەتەوە لە نووسینکەی سەری وردبووەوەو دواجار وتی:
"جا بزانە چیت پێ دەڵێم، دوا زەلام کە لەسەر ئەم وەتاغەدا دەخەوت ناڵبەند بوو، پیاوێکی زۆر باش و ڕێك و پێك بوو، پیاوێکی هێندە پاکو خاوێن بوو کە هەر حەزت دەکرد بەرخوردی بکەیت. وایش ڕاهاتبوو هەتا دوای نانخواردنیش دەستەکانی دەشووشت.
"ئەی ئیتر چۆن چۆنی ئەسپێ تێی دابوو؟" تووڕەییەکەی جۆرج هێدی هێدی بەرز دەبووەوە و دەورووژا. لێنیش کۆڵەکەی خۆی خستە سەر

چـەرپایەکەی تەنیـشت و دانیـشت، دانیـشت و بـەدەم داپـچڕانەوە چـاوەدێری جۆرجی دەکرد.

"جا گوێبگرە بزانە چی دەڵێم،" کرێکارە پیرەکە وتی و بەردەوام بوو:

" ئـا ئـەم ناڵبەنـدەی کـە نـاوی وایتیـی بـوو لـەو جـۆرە پیاوانـە بـوو کـە ئـەو پۆدرەیـەی لـە هـەموو شـوێنێك دەدا هـەتا ئەگـەر کـێچ و ئەسپێشی تیـا نەبوایـە، هـەر تـەنها بـۆ دڵنیـا بـوون، حـاڵی دەبێـت؟ دەبـا ئەوەشـت پـێ بڵـێم کـە بەچـی ڕاهـاتبوو، لـە کـاتی ژەمەکانـدا پەتاتـە کوڵاوەکـانی خـۆی، بەرلـەوەی بیـاخوات توێکڵـەکانیانی دادەمـاڵی و لەهـەموو وردە ڕەشـایی و لەککەیـەك، هـیچ گـرنگیش نـەبوو کـە چ جـۆرە لەککەوڕەشـاییەك بێـت، پـاکی دەکردنـەوە ئەوسـا دەیخـواردن. ئەگـەر لەککـە و پەڵەیـەکی سـووریش لەسـەرهێلکەیەکدا هەبوایـە، ئـەوا لێـی دەکـردەوە و ئینجـا دەیخـوارد. هـەتا لـە ناکامیـشدا هـەر لەبـەر خۆراکەکـە وازی هێنـاو ڕۆیـشت. ئـا ئـەو جـۆرە پیـاوە بـوو ئـەو، ئـاوا پـاك و بێگـەرد و تـەرپۆش بـوو، هـەموو یەکـشەممانێك، هـەتا ئەگـەر بـۆ هـیچ جێگایـەکیش نەڕۆیـشتبایە ئـەوا خـۆی هـەر پۆشـتەو پـەرداخ دەکـرد، هـەتا بۆینباخیشی دەبەست و ئەوساکە لە خانووی جێخەوی کرێکاراندا دادەنیشت.

"مـن زۆر دڵنیـا نـیم،" جـۆرج بـە بەدگومانییەکـەوە وتـی: " وتـت لەسـەر چـی وازی هێنا؟"

پیرەمێردەکـە قتـووە زەردیلەکـەی خـستە نـاو گیرفانییـەوە و گرێـی پەنجـەکانی لـە سمێڵـە چـەرمووە چـرپرە بابرەکـەی خـشاندو گـوتی: " هـا... هـەر لـە خۆیـەوە وازی هێنـا، هـەر بـەو چەشـنەی کـە کەسـێکی دیکـە واز لـەکار دەهێنـێ. ئـەو خۆی وتی بـەهۆی خواردنەکـەوە بـوو. لـە ڕاسـتیدا ئـەو دەیویـست بـۆ شـوێنێکی تـر بـڕوات. لەخواردنەکـەیش بـەولاوە هـیچ سـۆنگەیەکی تـری نـەدا بەدەستەوە. وەکـو چۆن هەرکەسـێکی تـر پـەیجۆری هـەقی خـۆی دەکـات. ئـەویش ئاوهـا شـەوێك وتـی: " دەستمەزدی ئەو ماوەیەم بدەنێ."

جۆرج ڕووکێشی دۆشەگەکەی هەڵبڕی و تەماشای ژێرەکەی کرد. بەسەریدا چەمایەوەو گونیە گووشەکانی بەدیقەت و وردییەوە پشکنی. دەرحاڵ لێنیش هەستایە سەرپێ و هەمان شتی لەگەڵ پێخەوەکەی خۆیدا دووپاتە کردەوە. جۆرج بەوە خۆشنوود دیاربوو. کۆڵەکەی کردەوەو شتەکانی، مەکینەی تراشەکەی و کوتە سابوونێك و شانەکەی و شووشەی حەبەکانی، هەتوانەکەی و مەچەکبەندێکی چەرمینی لەسەر ڕەفەکەدا دانا، پاش ئەوەیش بەرێکی و پوختیی وەتاغەکەی خۆی بە پەتووەکانی چێکرد. پیرەمێردەکە وتی:

"پێم وایە سەرکار تۆزێکی تر دێتە ئێرە. بێگومان ئەم بەیانییە گری گرتبوو کە ئێوە هێشتا نەهاتبوون. کاتێك کە ئێمە قاوەڵتیمان دەکرد لە پڕێکا هاتە ژوورەوەو گوتی: " کوان ئەو پیاوە تازانە لە چ دۆزەخێکن هەتا ئێستا؟" و ئینجا دۆزەخێکی پیشانی مەیتەرەکەدا."

جۆرج چرچ و لۆچییەکی لەسەر پێخەفەکەی خۆیدا ساف و چاك کردەوەو ئەوسا دانیشت و لێی پرسی: " وتت لە مەیتەرەکە خراپ تووڕە بور؟"

"بێگومان. چونکە ئەو مەیتەرە قولەڕەشە."

"قولەڕەشە، ها؟"

"بەڵێ. لە ڕاستیدا پیاوێکی باش و ڕێکوپێکە. پشتی ئەو جێگایەیدا کۆماوە کە ئەسپێك کاتی خۆی جوتکەی لێ وەشاندووە. سەرکاریش هەرکاتێ کە دەهەری و تووڕەبێت زۆری پێدەکات. بەلام مەیتەرەکە بەهیچ شێوەیەك دەربەستی ئەوە نایەت. ئەو هەر مژووڵی خوێندنەوەیە. زۆر دەخوێنێتەوە. لە ژوورەکەشیدا کتێبگەلێکی زۆری هەیە.

جۆرج وتی: " ئەم سەرکارە چ جۆرە پیاوێکە؟"

"لەڕاستیدا تا بڵێی پیاوێکی ڕێکوپێکە. ئەگەرچیش جاروبار بێرادە شێت و هار دەبێت، بەلام پیاوێکی زور باشە. جا گوێبگرە باپێت بڵێم، دەزانی

جـەژنی کریـسمەس چـی کـرد؟ گالۆنێـك وسـکی بـۆ ئێـرە هێنـاو وتـی: " کورگـەل بە ئارەزووی خۆتان بینۆشن. کریسمەس سالێی هەر تەنها جارێك دێت."

"ئەوە بەڕاستتە ! یەك گالۆنی پڕ وسکی هێنا؟"

"بـەڵێ قوربـان. ئـای خودایـە چـەند کـەیفمان کـرد. ئـەو شـەوە مۆڵـەتی قولەڕەشـە کـەیش درا بێتـە ئێـرە. قەتارچییەکی بـچکۆلانەمان لـەلادا هەیـە نـاوی "سمیتیـی" یـە، زۆرانبـازی لەگـەڵ قولەڕەشـەکەدا گـرت. هـەر بەڕاستیش زۆر بـە باشـی زۆرانـی دەگـرت. بـەلام کورگـەل نەیانهێـشت قاچـەکانی بـەکاربهێنێ. بۆیـە قولەڕەشـەکە زەفـەری پێـبرد. سمیتیـی دەیـوت ئەگـەر قاچـەکانی خـۆی بەکاربهێنابایـە، ئـەوا قۆلەڕەشـەکەی دەکوشـت. پیاوەکـان وتیـان لەبەرئـەوەی کـە قولەڕەشـەکە پـشت کۆمـە، سمیتیـی نـابێ قاچـەکانی بەکاربـەرێت." بـەهۆی تاموچێژی یادوەرییـەوە هەڵوەسـتەیەکی کـردو دواتـر وتـی: " دوای ئـەوە پیاوەکـان هـەموویان بـۆ رابـواردن و ژاوەژاو نانـەوە بـۆ سـۆڵێداد چـوون. بـەلام مـن لەگەڵیاندا بۆ ئەوێ نەچووم چونکە، ئیتر گوڕوتین و ئارەزووی ئەو شتانەم نەماوە."

ئێنـی ئـەو نانـە خـەریکبوو لـە چێکردنی وەتاغەکـەی دەبـووەوە کـە کلۆمـە دارینەکـە دووبـارە هەڵبڕرایـەوە و دەرگاکـە کرایـەوە. لـە ناوەنـدی دەرگـا کراوەکـەدا پیـاوێکی کورتـە بنـەی تێکـسمڕاو راوەسـتا بـووە. پـانتۆڵێکی شـینی جینـزو پیراهـەنێکی فلانێـلێ و یەلـەگێکی ڕەشـی دوگمـە نـەدراو و پالتۆیـەکی ڕەشـی لەبـەردا بـوو. کەلەموسـتەکانی بەتەنیـشت ئاوزوونەیـەکی چوارگۆشـەی پـۆلایینی نێـو ئـەملاولای پـشتێنەکەیدا گیرکردبـوو. شـەپقەیەکی " ستێتـسن" ی قـاوەیی گـڵێ ڕەنگـیش لەسـەریدا بـوو، پیتـاکی پاژنـە بـەرزو ئاژنـەداری بوتیـشی لەپێـدابوو تـا بـەدیاری بخـات کـە ئـەو یـەکێك نییـە لـە کارگـەرەکان. کرێکـارە پیرەمێردەکـە بەپەلـە تێـی ڕوانـی، ئەوسـا لەگـەڵ ڕۆیـشتنیدا گرێبەنـدی قامکەکانی لە سمێڵی خشاند و بەرەو دەرگاکە خۆی بەکێش کرد.

"ئـەوە پیاوەکـان هـاتن." ئەمـەی وت و بەتەنیـشت سـەرکاردا خـۆی بـە کـێش کـردو چـووە دەرێ. سـەرکارەکەش بـە شـەقاوە کورتەڵـە و بەلـەزەکانی پیـاوێکی قـاچ

ئەستوورەوە هاتە نێو ژوورەکە و وتی: " ئەم بەیانییە بۆ " مۆرەیی و ڕێدیی " م نووسی کە ئاتاجم بە دوو پیاو هەیە. بەرگەنامەی کارکردنی خۆتان پێیە؟"

جۆرجیش دەستی بۆ گیرفانی بردو بەرگەنامەکانی دەرهێناو بۆ سەرکارەکە درێژی کردن.

"خەتای " مۆرەیی ئاند ڕێدیی" نییە. لێرە لەسەر بەرگەنامەی کارەکاندا نووسراوە کە ئێوە دەبوایە ئەم بەیانییە بۆ ئیش ئێرە بن."

جۆرج سەری داگرت و لەپێیەکانی خۆی ڕاما و وتی: " شوفێری پاسەکە خەراپ ناڕاستەی کردین، ناچار بووین دە میل بەپێ بڕین. ئە کاتێکدا کە هێشتا نەگەیشتبووین ئەو پێی وتین ئەوەتا، گەیشتین. ئەم بەیانییەیش ئۆتۆمبێلمان دەست نەکەوت بانگەیەنێتە ئێرە."

سەرکارەکە بە چاوی نیمچە وێکهاتووەوە وتی: " چیبکەم گالیسکەی دانەوێڵەکە دووپیاویشی نوقسان بوو، بەلام ناچاربووم بینێرمە سەرکار. ئێستایش هیچ کەلکی ئەوەی نییە چنە سەرنیش هەتاکو دوای فراوین کردن." دەفتەری تۆمارنامەکەی لە گیرفانییەوە دەرهێناو ئەو شوێنەدا ئاوەلای کردەوە کە قەلەمێکی ڕەساس ئەنێو بەینی لاپەڕەکاندا جێگیربوو. جۆرج خێسە و مۆڕەیەکی مانادارانەی گرتە لێنی و لێنیش سەری ڕاوەشاند هەتا دەری بخات کەحاڵی بووە. سەرکارەکە قەلەمە ڕەساسەکەی بەلیك تەڕکردو وتی: " ناوت چییە؟"

"جۆرج میلتۆن."

"ئەی ناوی تۆ چییە؟"

جۆرج وتی: " ناوی ئەویش "لێنی سمۆل "ە."

ناوەکان لەنێو دەفتەرەکەدا تۆمارکران و سەرکارەکە وتی: " دەی با بزانین، ئا ئەمرۆ بیستی مانگە، نیوەڕۆی بیستی مانگ." ئینجا دەفتەرەکەی پێوەدا.

"کورینه ئێوه پێشتر له کوێ ئیشتان دەکرد؟"
جۆرجیش وتی: " له باکوور، له دەوروبەری ویلد."
ڕووی له لێنیش کردو وتی: " تۆیش هەر لەوێ؟"
جۆرج وتی: " بەڵێ، ئەویش هەر لەوێ."
سەرکارەکه گاڵتەئامێزانه به پەنجەیەك ئیشارەتی بۆ لێنی کردو وتی: " بەوە ناچێت پیاوێکی زۆربڵێ بێت. وانییه؟"
"نەخێر، پیاوێکی چەقاوەسوونییه، بەڵام بەڕاستی ئیش کەرێکی بێ هاوتایه و وەکو گایش بەهێزە."
لێنی لەبەرخۆیەوە زەردەی هاتێ و بەدەنگێکی نزم ئەو ڕستەیەی دوایی دووپات کردەوە: " وەکو گایش بەهێزە."
جۆرج مۆڕەیەکی لێکردو لێنیش لە خەجاڵەتیی ئەوەی کە قسەکانی ئەوی لەبیرچبووەوەو سەری دانەواند.
ناگەهان سەرکارەکه لێیپرسی: " گوێبگرە سەوڵ!" لێنیش سەری هەڵبڕی. " چ ئیشێکت پێ هەڵدەسوورێ؟"
لە پەشۆکاندا، لێنی تەماشای جۆرجی کرد تا دەستگیرۆیی بکات. جۆرجیش وتی: "هەرچییەکی پێ بسپێریت جێبەجێی دەکات. لەوەڕێنەرێکی بێوێنەیە. دەتوانێ گونیەی دانەوێڵە بگوازێتەوە. ئامێری جوتکردن باژوێت، هەموو شتێکی پێ هەڵدەسوورێ. تۆ هەر تاقە جارێك ئازمایشی بکە، دەیبینی."
سەرکارەکه ڕووی بەلای جۆرج دا وەرگێڕا و وتی: " ئەی کەوایە بۆچی لێیناگەڕێی خۆی پاسخ بداتەوە؟ بەتەمای چیت؟"
جۆرجیش بەدەنگێکی بەرزەوە ئاخاوتنی پێ بڕی و وتی: " ئۆها! خۆ من نالێم ئەو کەسێکی زرنگ و لێهاتووە. نەخێر ئەو وانییە. بەڵام من دەڵێم ئیشکەرێکی زۆر بێهاوتایە. دەتوانێ بەئاسانی فەردەیەکی چوارسەد پاوەندیی هەڵبگرێت."

سەرکارەکە بەکاوەخۆ دەفتەرە بچکۆلەکەی خستە نێو گیرفانییەوە و لەنێو کەمەربەندەکەیدا کەڵەموستەکانی گیرکرد و چاوێکی تەقریبەن وێکهێنایەوە وەك بڵێیت نوقاوە و وتی: "پێم بڵێ چ فرتوفێڵێکت بەدەستەوەیە؟"

"چی... یی ؟"

"دەڵێم چەندت لەم کابرایە دەست دەکەوێت؟ ئایا تۆ دەستمەزدەکەی لێ دەستێنی؟"

"نەخێر، بێگومان من لێی ناستێنم. تۆ بۆچی پێت وایە کە من ناپاکی لەگەڵدا دەکەم؟"

"ئاخر من هەرگیز پیاوێکی وام نەبینیووە کە بۆ پیاوێکی تر بەرگەی ئەو هەموو سەرئێشە و نارەحەتییە بگرێت. من هەر تەنها ئەوەم پێخۆشە کە بزانم بەرژەوەندی تۆ لەمەدا چییە؟"

جۆرجیش وتی: " ئەم پیاوە... ئامۆزامە.. بەڵێنم بەدایکە پیرەکەی داوە کە ئاگام لێی بێت. چونکە ئەو عانەی کە منداڵ بوو نەسپێك جوتکەی لە کەللە سەری وەشاند. زۆر باش و ساخڵەمە. هەر تۆزێك کەودەنە و هیچی تر، بەلاّم هەرچییەکی پێ بسپێردرێت ئەنجامی دەدات."

سەرکارەکە تیوە وەرچەرخانێك بەلادا وەرچەرخاو وتی: " زۆر باشە، بێگومان خواش دەزانێ کە ئەو بۆ پڕکردنی گونیەی جۆ پێداویستی بە عەقڵ و ئاوەز نییە. بەلاّم نەخەڵەتابی فریووم بدەیت میلتۆن. چاودێریت دەکەم. ئەی تۆ پێم بڵێ بۆچی لە وید وازتان لە ئیش هێنا؟"

جۆرج بێ درەنگ وتی: " ئیشەکە تەواو بوو."

"چ جۆرە کارێکتان دەکرد؟"

"ئێمە... ئێمە زێرابمان هەڵدەکەند."

"دەی باشە. بەلاّم نەخەڵەتابی تەفرەم بدەیت. چونکە هیچ شتێکت بۆ ناچێتە سەر. من پێشتر پیاوی ژیرو زیرەکی زۆرم بینیووە. پاش

نیوەڕۆژە کردن لەگەڵ گالیسکەی دانەوێڵەکەدا بچنە سەر نیش. ئەوان لەلای دەڕاسەکە جۆ کۆدەکەنەوە. تا، ئێوە لەگەڵ دەستەکەی "سلیم" دا بڕۆنە سەر نیش."

"سلیم؟"

"بەڵێ. قەتەرچییەکی کەتەی زلە و لەکاتی نانخواردندا دەیبینی." ئەوسا لەپڕێکا وەرسووڕاو بەرەو دەرگاکە رۆیشت، وەلێ بەرلەوەی بچێتە دەرەوە ڕووی وەرگێڕاو بۆماوەیەکی درێژخایەن لەهەردوو پیاوەکە راما.

کاتێکیش کە دەنگی هەنگاوەکانی ڕەوینەوە، جۆرج ئاوڕی لە لێنی دایەوەو وتی: " کەواتە بەتەمای ئەوە نەبووی کە فزەو ورتە بکەیت. دەبوایە زارە گەورەکەت داخەیت و بێگەرێی من قسان بکەم. هەی لەعنەتیی هێندەی نەمابوو ئیشەکەمان نە کیس بدەیت."

لێنی بە بێئومێدییەکەوە چاوی بڕییە دەستەکانی خۆی و وتی: " جۆرج لەبیرم چوو."

"ئا، بەڵێ.. لەبیرت چوو. خۆ تۆ هەمیشە لەبیرت دەچێت و منیش هەمیشە دەبێ فریات بکەوم و دەربازت بکەم."

دواجار بە قورسییەکەوە لەسەر چەرپایەکەی خۆی دانیشت و وتی: " ئێستە ئیدی سەروەرچاودێریمان دەکات. ئیتر دەبێ ئاگادارین و هیچ هەڵەیەك نەکەین. تۆیش دەبێ ئیدی زارە گەورەکەی خۆت داخەیت." ئیدیا بە مرج و مۆنیی و بێدەنگییەوە داکەوت.

"جۆرج."

"ها، ئێستاکە چیت دەوێ؟"

"ئەسپ جووتکەی نەکەللەم نەداوە، کەی جووتکەی لە کەللەم داوە جۆرج؟"

جۆرج ڕقـی هەڵـساو بـە توڕەییـەوە وتـی: " شـتێکی زۆر بـاش دەبـوو ئەگـەر جووتکـەی لێـت بدابایـە، چـونکە خـەڵکی لەیـەك دنیـا دەردەسـەری و گێروگـاز ڕزگاردەکرد."

"جۆرج تۆ وتت من ئامۆزاتم."

"دەی باشـە، ئـەوە درۆ بـوو. زۆریـش خۆشـحاڵم بـەوەی کـە درۆ بـوو. چـونکە ئەگـەر مـن خزمـی تـۆ بوومایـە ئـەوا خـۆمم دەکوشـت." لـە ناکـاو لەقـسەکردن وەسـتا، بـەرەو دەرگـا کراوەکـە ڕۆیـشت و چـاوی بڕییـە دەرەوەو وتـی: " هێـی پـێم بڵێ، ئەوە گوێ لە چی دەگریت؟"

پیـاوە بـە ساڵداچـووەکە فـرە بـە هێـوری هاتـە نێـو ژوورەکـەوە و گـسکەکەشی هـەر بـە دەسـتەوە بـوو. بەدوایـشییەوە سـەگێکی گەلـەی لاق کێـشکەری لمۆزبـۆرو چـاوکتوکوێری پیرسـاڵ دەڕۆیـشت. سـەگەکە تەقـەلای دا هـەتا بـە شەلەشـەل خـۆی گەیانـدە پـەنای ژوورەکـە، لـەوێ پاڵکـەوت و دەسـتی کـرد بـە مرخانـدن و پاشـان کەوتـە لێـستنەوەی کورکـە داڕزاوە دێـزو بـۆرە گەڕەکـەی. کرێکـارە پیرەکـە چـاودێری کـرد هـەتا لەوێـدا جێگیربـوو، ئینجـا وتـی: " مـن گـوێم ڕانـەگرتبوو. هـەر تـەنها سـاتەوەختێك لەبـەر سـێبەرەکەدا وەسـتام سـەگەکەم خوراند. مـن زۆر نابێ لە خاوێن کردنەوەی "وۆش هاوسەکە" ێ بوومەوە."

جـۆرج وتـی: " نـا، نـەخێر تـۆ گوێـچکە زلـەکانت دەژەنییـە نێـو کاروبـاری ئێمەوە، من حەز لە هیچ کەسێکی لاپرەسەن ناکەم."

پیرەمێردەکـە بـە نارەحەتییەکـەوە تەماشـای جـۆرجی کـردو نیگاکـەی گواسـتەوە سـەر لێنـی و ئینجـا دووبـارە نیگاکـەی گێڕایـەوە سـەرجۆرج و وتـی: " مـن هـەر ئێـستا هاتمـە ئێـرە و هـیچ شتێکیـشم لـە وتووێژەکـەی ئێـوە نەبیـست و مگێـزی ئـەوەیش ناکـەم بیبیـستم. پیـاوو کرێکـاری نێـو مـەزرایش قـەت گـوێ ڕانادێرێ و قەتاوقەتیش پرسیار ناپرسێت."

ئینجا دوای ئەوە جۆرج ئەختێك هێدی بووەوەو وتی: " زۆر ڕاستە نابێ وا بکات، بەتایبەتی ئەگەر بیەوێ بمێنێتەوەو ماوەیەکی دوورودرێژ کاربکات."

بەلام بە بەرەڤانی کردنی تەمیزکارەکە سەرلەنوێ دڵنیابووەوەو وتی: " وەرە ئەختێك دانیشە. ئەو سەگەی تۆ زۆر بەساڵداچووە."

"بەڵێ وایە. هەر لە کاتی تووڵەییەوە لەلامە. ئای خودای گەورە کاتێ کە تازەکارو ئەوجەوان بوو چەند سەگێکی گەلەی نایاب بوو." ئەمەی وت و گسکەکەی بە دیوارەکەدا هەڵپەسێراو بە گرێبەندی ئەنگوستەکانی مووی زبرو چەرمووی سەر ڕوومەتەکانی خوراند و پرسی: " سەرکارەکەمانت پێ چۆنە؟"

"زۆرباشە. بەوە دەچێت پیاوێکی باش بێت."

تەمیزکارەکەیش بەو قسەیەی هاوڕابوو وتی: " پیاوێکی زۆر باش و ڕێکوپێکە، بەلام دەبێ لێی تێبگەیت."

ئالەو ساتە وەختەدا لاوێکی ڕیوەڵەی چاوقاوەیی و قژچڕو پڕو لوولی گەنمڕەنگ هاتە نێو خانووی کرێکارەکانەوە. دەست کێشێکی کارکردن لە دەستەچەپیدا بوو، ئەویش هەروەکو سەرکارەکە بوتی پاژنە بەرزی لەپێدابوو، پرسی: " باوکمتان بینیووە؟"

تەمیزکارەکە وتی: " کێرلی باوکت ڕێك بەر لە چرکە ساتێك لێرە بوو. وابزانم بۆ ئاندینەکە ڕۆیشت."

کێرلیش وتی: " هەوڵ دەدەم پێیڕابگەم." بەلام کاتێ کە چاوەکانی بەسەر پیاوە تازە هاتووەکاندا تێپەڕین ڕاوەستاو نەڕۆیشت. سەرەتا بەسستییەکەوە نیگای جۆرجی کردو دواتریش نیگای لێنی کرد. هێدی هێدی باسکەکانی لە ئانیشکەوە چەمانەوەو دەستەکانیشی داخران و بوونە مستەکۆڵە. ئینجا گرژو سفت هەڵگەڕاو کەوتە نێو سووکە گرمۆڵە بوونێکەوە. دەمودەست نیگاکانی وردبوونەوەو ئەگریسییان بەدیارخست. لێنی لەژێرکاریگەری ئەو تێڕامانەدا شلەژاو بەناڕەحەتی و نیگەرانییەوە پێیەکانی جووڵاندەوە. کێرلیش بەپارێزو وریاییەوە لێی نزیك کەوتەوە.

"ئێوە ئەو پیاوە تازانەن کە باوکم چاوەڕێی دەکردن؟"
جۆرجیش وتی: " ئێمە هەر ئا ئێستا کە هاتین."
"دەبێلە با ئەو پیاوە زلە بدوێ."
لێنیش لەشەرم و تەریقیدا سەری لێ شێوابوو.
جۆرج وتی: " ئەی ئەگەر گریمان نەیەوێت قسە بکات؟"
کێرلیش جەستەی خۆی بەملاو ئەولادا ڕاوەشاندو وتی: " بەمەسیح کاتێ کە قسەی لەگەڵدا دەکرێت دەبێ وەڵام بداتەوە. ئەی پێم بڵێ تۆ بۆچی خۆت هەڵ دەقورتێنیتە ناو ئەم گفتوگۆیەوە؟ جۆرجیش بەکەمتەرخەمییەکەوە وتی:
"لەبەرئەوەی هاوسەفەرو هاوڕێی یەکین."
"ئۆ، کەواتە لەبەرئەوەیە."
جۆرج شپرزە و مەندو بێ جووڵەبوو، وتی: " بەڵێ، لەبەرئەوەیە."
لێنی دۆشداماوانە بۆ ڕێنمایی کردن تەماشای جۆرجی دەکرد.
"کەواتە تۆ ناهێڵیت ئەو پیاوە زلە بناخڤێت، وانییە؟"
"ئەگەر بیەوێ شتێکت پێ بڵێت ئەوا خۆی دەتوانێ قسە بکات." پاشان بە سووکییەوە سەرێکی بۆ لێنی لەقاند.
لێنیش بە دەنگێکی نزمەوە وتی: " هەر ئا ئێستا کە هاتین."
کێرلی هێمن و خۆ ڕاگرانە لە لێنی ڕاماو وتی: " کەواتە ئەگەر جارێکی تر قسەت لەگەڵدا کرا وەڵام بدەرەوە، باشە؟ " ئەوسا بەرەو دەرگاکە وەرگەڕاو چووە دەرەوە، ئانیشکەکانیشی هێشتا هەر ئەختێك دەرپەڕیبوون.
جۆرج لە دواوە چاودێری ڕۆیشتنی کردو پاشان ئاووڕی لە تەمیزکارەکە دایەوەو وتی: " پێم بڵێ، ئەمە خەم و سکالای چی هەیە؟ خۆ لێنی هیچ خراپەیەکی لەگەڵدا نەکردووە."
پیرەمێردەکەش بۆ ئەوەی لەوە خاترجەم بێت کە کەس گوێی لێیان نەگرتووە بە ئاگاو دیقەتەوە تەماشای دەرگاکەی کردو بە دەنگێکی هێواشەوە وتی: " ئەوە

کێرلییە کوڕی سەرکارەکەمانە، بۆکسبازێکی بەتوانا و کارامەیە. لەنێو مەیدانی بۆکسبازیشدا زۆر بۆکسێنی کردووە. بۆکسبازێکی سەنگ سووك و کارامەیە."

جۆرجیش وتی: " جابا بۆکسبازیش بێت، خۆنابێ لێنی تووش بکات. لێنی هیچ خراپەیەکی نەگەڵدا نەکردووە. ئیتر چ شتێکی لە دژی لێنی دا هەیە؟"

تەمیزکارەکە کەوتە تێهزرین.. و وتی: " ئاخر.. چیت پێ بڵێم. کێرلی هاوچەشنی زۆربەی زۆری پیاوە بچووك و گرگنەکانە. ڕقی دنیای لە پیاوە گەورەو زلحۆرتەکانە و هەموو کاتێکیش شەڕیان پێ دەفرۆشێ. وەك بڵێیت زۆر لێیان شێتگیربێت چونکە خۆی پیاوێکی زەبەلاح نییە بۆیە. تۆ پیاوی لەو بابەتەت زۆر دیتووە کە هەمیشە شەڕ دەفرۆشن، وانییە؟"

جۆرجیش وتی: " بێگومان، گەلێکم لەو پیاوە بچووك و گولە کەللەشەقانە دیتووە. بەلاّم بەهەرحاڵ چاکتروایە ئەم کێرلییە دەستبەرداری لێنی بێت و هیچ خەتایەکی بەرامبەر نەکات، چونکە لێنی بەسەلیقە نییە و ئەم کێرلییە حیزەیش ئەگەر زۆر سەربخاتە سەرییەوە ئەوا زەرەر دەکات."

تەمیزکارەکە بە بەدگومانییەکەوە وتی: " نازانم، بەلاّم دەزانم کە کێرلی زۆر بەدەست و شارەزایە. بەلاّم من ئەو بەرەنگاربوونەوەیەم هەرگیز بەڕاست نایەتە بەرچاو. گریمان کێرلی پەلاماری پیاوێکی زلحۆرتی دا و بەزاندی، ئەوسا هەموو ئەوانەی دەوروبەری دەڵێن ئای لەکێرلی، چ پیاوێکی ئازاو بەغیرەتە. ئەی ئەگەر گریمان هەمان شتی کردو بەزێنرا، ئەوەدەمە هەموو خەڵك دەڵێن پیاوە زل و زەبەلاحەکە دەبوایە یەکێکی بەقەدەر خۆی هەڵبژێرێت، لەوانەشە گەلەکۆمەکێ لەپیاوە زل و گەورەکە بکەن. هەرگیز ڕاست و لوواو نەهاتە بەرچاوم. لەوەیش دەچێت کە کێرلی فرسەت بەهیچ کەسێك نەدات."

جۆرج لەکاتێکا کە نە دەرگاکە ڕامابوو، بەبەدگومانییەکەوە وتی: " کەواتە چاکتروایە خۆی نە لێنی بپارێزێ. ئەگەر چی لێنی بۆکسباز نییە، وەلێ فرە بەهێزو

چـاپووکە و پـەیڕەوی هـیچ یاسـایەکیش ناکـات." ئینجـا بـەرەو مێـزە چوارگۆشـەکە ڕۆیـشت و لەسـەریەکێ لـە سنووقەکاندا دانیـشت. هەنـدێکی لـە کاغـەزەکان کـۆکردەوەو کەوتـە تێکوەردانیـان. پیرەمێردەکـەیش لەسـەر سـنووقێکی تـردا دانیـشت و وتـی: "ئەمانـە بـەکێرلی نـەڵێیت کـە مـن بـۆم گێڕایتـەوە. نـەگینا دەرم دەکـات و هـیچ دەربەستیش نایەت، چونکە باوکی ئەو سەرکارە و هەرگیز لەئیش دەرناکرێت."

جـۆرج کاغـەزەکانی شـکاندو دەسـتی بەهەڵگێڕانـەوەیان کـرد، یـەك یـەك سـەیری کاغـەزەکانی دەکـردو تـووڕی هەڵدەدانـە سـەر کەڵەکـە کاغـەزێکی تـری سـەرمێزەکەو وتـی: "بـەوە دەچـێ ئـەم کێرلییـە زۆر کـوڕی قەحپـەو حـەرامزدە بێت. من پیاوی گزگل و بوودەڵەم خۆش ناوێ."

تەمیزکارەکـەیش وتـی: "مـن وایـدەبینم کـە بـەم دوا دواییـە خـراپتر بـووبێ.. بـەر لـەدو هەفتـە ژنـی هێنـا، ژنەکـەی لـەماڵی سـەرکاردا دەژێـت. وەك بڵێیـت لـەو کاتەوەی کە ژنەکەی هێناوە لەخۆی بایی تر بووە."

جـۆرج بۆڵـە بـۆڵێکی لێوەهـات و وتـی: "لەوانەیـە خـۆی بنـوێنێ هـەتا سەرنجی ژنەکەی ڕابکێشێت."

تەمیزکارەکـەیش کـەبۆ مقۆمقۆکـەی خـۆی کـەوتبووە جـۆش و خرۆشـەوە وتی: "ئەو دەستکێشەی دەستی چەپیت بینیووە؟"

"ئا، بینیوومە."

"ئەو دەستکێشە تژییە لەهەتوانی ڤازەلین."

"ڤازەلین؟ بۆچی؟"

"باشـە گـوێبگرە، کێـرلی دەڵێ ئـەو دەسـتە نـەپێناو ژنەکەیـدا بەنـەرم و نـۆڵی دەهێڵێتەوە."

جـۆرجیش سـەرقاڵانە لـە کاغـەزەکان وردبـووەوەو وتـی: "بەڕاسـتی ئـەوە شتێکی زۆر ناشرینە لەملاولەولادا بوترێت و بڵاو بێتەوە."

پیرەمێردەکە بەوە خاترجەم ببووەوە کەقسەیەکی ئاوای لە جۆرجەوە دەرکێشابوو. ئێستایش ئیتر هەستی بەئاسوودەیی دەکردو بەبڕوابە خۆ بوونێکی زیاترەوە قسەی دەکرد. بۆیە وتی: " چاوەڕوانبە هەتا ژنەکەی کێرلی دەبینی." جۆرج دووبارە کاغەزەکانی شکاندەوەو ڕیزێك سۆلیتێری(١) داناو هەروا بێمەبەست بەکاوەخۆ و هێواشێك پرسی: " جوانە؟"

"بەڵێ زۆر جوانە.. بەڵام.."

جۆرج لەکاتێکدا کەلە کاغەزەکانی بەردەمی ورددەبووەوە وتی: " بەڵام چی؟"

"چی بڵێم. زۆر چاو ئەدەرە."

"بەڕاستتە؟ دوو هەفتەیە مێردی کردووەو چاو باشقاڵی دەکات؟ بۆیە دەرپێکەی کێرلی پڕێتی لە مێرووله، ڕەنگە هەر ئەوەش هۆی لەخۆبایی بوونەکەی بێت."

"بینیوویشمە کە چاوی لەسلیم قرپاندووە. سلیم ئەو براڕەیە کە ولاخەکان دەلەوەڕێنێ. لەڕاستیشدا گەنجێکی ماقووڵ و جوامێرە. سلیم پێویستی بەوە نییە لەسەر گالیسکەی دانەوێلەکەدا بوتی پاژنە بڵند لەپێ بکات. بینیوومە چاوبڕکێی لەگەڵ سلیم دا کردووە. بەڵام کێرلی ئەوەی قەت نەبینیووە. هەروەها بینیوویشمە کە چاوی لە کارڵسۆن قرپاندووە."

جۆرج بەبێ نواندنی ئارەزوو وتی: " بەوە دەچێت لێرە کەیف و سەفا بکەین." ئەمیزکارە بە ساڵداچووەکە لەسەر سنووقەکەی خۆی هەستاو وتی: " دەزانی دەمەوێ چی بڵێم؟" جۆرجیش وەڵامی نەدایەوە. "دەڵێم، پێم وایە کێرلی سۆزانییەکی خواستووە."

جۆرجیش وتی: " ئەویەکەم کەس نییە وای کردبێ، خەڵکێکی زۆر ئەوەیان بەسەرهاتووە."

---

(١) Solitaire: جۆرێکە لەیاری کاغەز کە تەنیا یەك کەس دەیکات.

ئینجا پیرەمێردەکە ڕووەو دەرگاکە کشاو سەگە زۆر پیرەکەشی سەری بڵند کردەوەو بەدەوروبەری خۆیدا هەڵیڕوانی و پاشان بە ئازارو ڕەنجێکی بێپایانەوە بۆ ئەوەی دوای خودانەکەی بکەوێت کەوتە سەرپێیەکانی. "دەبێ بڕۆم بۆ پیاوەکان شتومەکی حەمام ئامادە بکەم. هەر هێندەی پێناچێت گالیسکەی دانەوێڵەکە دێتەوە. ئەی پێم بڵێ ئێوە بۆ گو ستنەوەی جۆ دەڕۆن؟"

"بەڵێ."

"خۆ ئەو شتانەی کە من وتم هیچیان بۆ کێرلی ناگێڕیتەوە؟"

"نەخێر، بۆ بۆی دەگێڕمەوە."

"جەناب، هەرتەنها یەك جار تەماشای بکە، ئەوسا دەزانی چ قەحپەیەکە."

لە ناکامدا بۆ دەرەوە چووە نێو خۆرە تاوێکی بێهاوتاوە.

جۆرج بەبایەخ و تەرتیبێکی شیاوەوە کاغەزەکانی داناو کەڵەکەکەی کرد بە سێ کۆمەڵە و چوار سێپەڕەی هاویشتە سەر کەڵەکەی برنییەکان.

تیشکی هەتاو ئێستا ئیدی لەسەر عەرزەکەدا چوارگۆشە دیاربوو و مێشەکانیش لەمیانەی تیشکەکانەوە پزیسك ئاسا لە جۆش و خرۆشدا بوون. لە دەرەوەڕا دەنگی زرنگ و هوڕی قایش و زین و لغاو و ئاوزەنگی چارەوییەکان و جیڕەجیڕی تەوەرەو ئاکسلی ژێربراری قورسی گالیسکەکان دەهاتە بەرگوێ. لە دووریشەوە دەنگێکی ساف و ئاشکرا هاواری دەکرد: "مەیتەر...هۆ هۆ مەیتەر!" و دواسایش وتی: " ئەو قولەڕەشە لەعنەتییە لە چ دۆزەخێکدایە؟"

جۆرج لە سۆلیتێرەکەی بەردەمی خۆی ڕاماو ئەوسا هەموو کاغەزەکانی پێکەوە تێکوەردا و بەلای لێنیدا ئاوڕی دایەوە. لێنیش لەسەر چەرپایەکەدا هەڵاژا بوو تەماشای ئەوی دەکرد.

"لێنی گوێبگرە! ئێمە سەقامگیرنین و ترسم لێ نیشتووە. تۆ لەگەڵ ئەو کێرلییەدا کێشەو گرفتت دەبێ. پێشتر زۆرم ئەو چەشنە پیاوانە دیتووە. دەیویست شارەزات بێت و نەمەحەکت بدات. ئێستا لەو بڕوایەدایە کە چاوترسی کردوویت و هەر هەڵێکیشی بۆ هەڵکەوێت زرمەت لێ هەڵدەستێنێ."

پەروا چاوەکانی لێنییان داگرتبووەوەو بەخەم و کەسەرەوە وتی: " جۆرج، من پێداویستیم بەهیچ جۆرە بەلاّ و سەرئێشەیەك نییە، ئاگاداربە، مەهێڵە لێم بدات."

جۆرجیش هەستاو چووە لای چەرپایەکەی لێنی و لەسەریدا دانیشت و وتی: " من بەڕاستی ڕقم لەو جۆرە پیاوە نامەرد و سەگبابانەیە، زۆرم لەو کەسانە بینیووە. هەروەکو پیرەمێردەکەیش وتی، کێرلی هیچ سەچلی ناکات و هەمیشەیش هەر سەرکەوتووە."

ئینجا بۆچرکەستێك تێفکری و وتی: " لێنی، ئەگەر ئەو لەگەڵ تۆدا بکەوێتە ناکۆکی کردن، ئەوا بێ شك لێرە دەردەکرێین. بۆیە ئەو بارەیەوە ئاگاداربە و چاوت بکەرەوە، بیرت نەچێ ئەو کوڕی سەرکارەکەیە. باش گوێ بگرە لێنی، خۆتی لێ دووربگرە، بۆخاتری خوا خۆتی لێ دووربگرە.. وهیچ قسەی لەگەڵدا مەکە. ئەگەر ئەو هاتە تێروکانە ئەوا تۆ بچۆرە لایەکی تری ژوورەکە. لێنی ئا ئەمانە ئەنجام دەدەیت وانییە؟"

لێنیش بڵمە بڵمێکی کردو وتی: " من هیچ گێرمەو کێشەیەکم ناوێ، خۆمن هیچ شتێکم لەو نەکردووە."

"بەلاّم کردبێتت یان نا هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ و هیچ کەلکیشی بۆتۆ نابێ ئەگەر کێرلی بۆ شەڕکردن بیەوێت بە بۆکس بەربێتە سەرو گوێلاکت. هەروەکو وتم هیچ هەقت بەسەرییەوە نەبێ. دەبێ ئەمەت لەبیرنەچێ، باشە؟"

"باشە جۆرج. من هیچی لەگەڵدا نالێم."

دەنگــی نزیکبوونــەوەی گالیــسکەی دانەوێڵــەکان و زرمــەزرمی سمــە گــەورەکانی ســـەر عـــەرزە ســـەخت و ڕەقەلانەکـــەو سیڕەســـیڕی برێکـــەکان و زرەزری زنجیرەکـــان و قایـشی نێـوانی ئەسـپەکان و عەرەبانـەکان بـەرزتر بـووەوە. پیاوەکـانیش لەمـسەرەوە بـۆ ئـەو سـەری گالیـسکەکان هـاوارو هـەڵڵایان بـوو. جـۆرجیش لەتەنیـشت لێنـی لەسـەر چـەرپایەکەدا دانیـشتبوو، کـەوتبووە تیهزرینێکـی قـووڵ و دەموچـاوی گـرژو مـۆن هەلگەڕابوو. لێنی بەترس و لەرزەوە پرسی: " خۆ تۆ تووڕە نەبوویتە جۆرج؟"

"مـن ڕقـم لـە تـۆ هەڵنەسـاوە. مـن ڕقـم ئـا لـەو کێرلییـە ژارو نامـەردە هەڵـساوە. بـە ئومێـدی ئـەوەبووم کـە هەنـدێ پـارە پێکـەوە پەیـدا بکـەین.. بـە ئومێـدی ئـەوە بـووم بـەڵکو پێکـەوە سـەرد دۆلاێـك دەسـتگیربکەین." ئەوسـا دەنگی لێبڕاوو زەبردار هەلگەڕاو وتی: " خۆت لە کێرلی دوور ڕابگرە نێنی."

"بێگومان جۆرج خۆمی لێ دوور ڕادەگرم و ورتەشی نەگەڵدا ناکەم."

"مۆڵـەتی ئـەوەی مـەدە ڕاپێـچت بکاتـە نێـو تەگـەرەوە... بـەلام.. ئەگـەر ئـەو کوڕی قەحپەی حەرامزادەیە لێی دایت.. تۆیش وانەیەکی دابدە."

"جۆرج، وانەی چی دابدەم؟"

"هـیچ... هـیچ... کـاتی خـۆی پێـت دەڵـێم. مـن قیـنم لـەو جـۆرە پیاوەیـە. لێنـی گـوێم لێبگـرە، ئەگـەر تووشـی هـەر جـۆرە گیروداریـك بوویـت ئـەوەت دێتـەوە بیر کە پێم وتی چی بکەیت؟"

لێنـی بەسـەر ئانیـشکەکانیا ئـەختێك بلنـدبووەوەو بیرکردنـەوە بەتـەواوەتی چـارەی شـێواند. دواجـار بـە خەمگینییەکـەوە چـاوەکانی بـەرەو سـیمای جـۆرج گواستەوەو وتی:

"ئەگـەر بکەومـە نێـو هـەر کێـشەیەکەوە. ئـەوا ئـیتر تـۆ ناهێڵیـت مـن کەروێشکەکان بەخێوبکەم."

"مـن مەبەسـتم ئـەوە نـەبوو. دێتـەوە بـیرت دوێنـێ شـەو لـە کـوێ نووسـتین؟ ئالەو خوارە لە کەناری رووبارەکەدا؟"

"بەڵێ دێتەوە بیرم. ئا بێگومان دێتەوە بیرم! دەچمە ئەوێ و خۆم لەنێو بێشەڵانەکاندا دەشارمەوە."

"خۆت دەشاریتەوە هەتا ئەو کاتەی من بۆلات دێم. مەشهێڵە هیچ کەسێك بتبینێ. لەنێو بێشەڵانەکانی گوێی ڕووبارەکەدا خۆت بشارەوە. دەی کەرەتێکی تریش ئەمە دووپات بکەرەوە."

"لەنێو بێشەڵانەکانی قەراغ ڕووبارەکەدا خۆم دەشارمەوە. لەو خوارە لەنێو بێشەڵانەکانی قەراخ ڕووبارەکە خۆم دەشارمەوە."

"ئەگەر تووشی گێرمەو کێشە بوویت."

"ئەگەر تووشی گێرمەو کێشە بووم."

لە دەرەوەدا خشەو سرەی برێکی گالیسکەیەك دەنگی دایەوە و یەکێك شیتاندی:

"مەیتەرەکە... هۆ مەیتەرەکە."

جۆرجیش وتی: " ئێنی خۆبەخۆ بیلێرەوە بۆ ئەوەی لەبیری نەکەیت."

لەبەرئەوەیش کە ناگەهان تیشکی لاکێشەیی هەتاوەکەی نێو دەرگاکە دیارنەما، هەردووکیان سەیری بەرەو ژووریان کرد. کچێکی چاو گەورەی لێو خڕوپڕو سووراو داری ئەرادەبەدەر بە نارایشت و دەست بەخۆداهێناو لەنێو دەرگاکەدا وەستابوو تەماشای ناوەوەی دەکرد. نینۆکەکانی بە بۆیەی سوور بۆیەکرابوون و پرچیشی بەشێوەی دەسکەنەی بچکۆلانەی نوولکراو بەچەشنی سۆسج شۆڕببووە خوارەوە و کراسێکی کەتانیی نێو ماڵی پۆشیبوو لەو نەعلە سوورانەشی نەپێدابوو کە لە شوێنی پاژنەکانیدا چەپکە پەڕی سووری بچکۆلانەی وشترمورغ هەبوو، بەهێواشی وتی: " بۆ کێرلی دەگەڕێم." و دەنگیشی کالیتەیەکی منگن و ناسکی هەبوو.

جۆرج ڕووی لەو وەرگێڕاو سەیری لایەکی تری کردو پاشان دووبارە ڕووی لێ نایەوەو وتی:

"تۆزێك بەر لە ئێستا لێرە بوو، بەڵام ڕۆیشت."

"ئۆی!"

دەستەکانی خستە پشتییەوەو خۆی بەسەر چێوەی دەرگاکەدا دا بۆ ئەوەی لەش و لاری بکەوێتە دەرەوەو وتی: "ئێوە پیاوە تازە هاتووەکانن وانییە؟"

"بەڵێ."

چاوەکانی لێنیش بەسەربەدەنی دا هەڵگەڕان و لێی وردبوونەوە، ئەویش نەختێك خۆی بادا وەك بڵێیت بایەخ بە لێنی نادا و سەیری ناکات. ئینجا لە نینۆکەکانی خۆی ڕاماو ڕاڤەکارانە وتی: "جاروبار کێرلی لێرەدایە."

جۆرجیش بە ڕەقی و ناشرینییەکەوە وتی: "جا بڵێم چی، ئێستا لێرە نییە."

ئەویش بە ڕووخۆشیی کەمتەرخەمییەکەوە وتی: "ئەگەر لێرە نەبێت، چاکتر وایە لە شوێنێکی تردا بۆی بگەڕێم."

لێنی بەسەرسامییەوە لێی ڕامابوو جۆرجیش وتی: "ئەگەر چاوم پێی بکەوێت، ئەوا پێی ڕادەگەیەنم کە تۆ بۆی دەگەڕێیت."

ئەویش زەردەخەنەیەکی زۆر شەیتانانەی بۆ کرد و لە شۆلاری خۆی ڕاوەشاندو وتی:

"ئێ خۆ گەڕان بەدوای کەسێکی تردا شوورەیی نییە."

دەنگی ئەو هەنگاوانە دەهاتنە بەرگوێ کە لە پشتییەوە دەهاتن. هەر کە لاشی کردەوە وتی: "ئۆو ڕۆژباش سلیم."

دەنگی سلیمیش لەلای دەرگاکەوە بیسترا کە وتی: "ئێی ڕوژباش ئەی کچی ئێسك سووك."

"سلیم دەمەوێ کێرلی بدۆزمەوە."

"وا دیارە زۆر بەچاکی بۆی ناگەڕێیت. بینیم چووە ماڵەکەی خۆتانەوە."

ئەویش ناکاو ڕاچڵەکی و وتی: "خوا حافیز کورگەل." و چووە ناو خانووی کرێکاران و ئینجا بە پەلەپرووزێ دوورکەوتەوە.

جۆرجیش تەماشایەکی دەوروبەری لینی کردو وتی: " ئەمە چ قەحپەیەکە خودایە، کەواتە ئا ئەمە ئەو ئافرەتەیە کە کێرلی بۆخۆی هەڵیبژاردووە و خواستوویەتی."

لینیش وەکو ئەوەی بەرگری لێ بکات وتی: " کچێکی زۆر جوانە."

"ڕاستە، بێگومان ڕاستە و شاراوەش نییە. بەڵام گێچەڵ و دەردەسەری کێرلی لە دواوەیە. گرەویش دەکەم کە ئەم ژنە بە بیست دۆلار لەگەڵتدا دەڕوات."

لینی هێشتا هەر لە نێوەندی دەرگاکە ڕامابوو ڕێك لەو شوێنەی کە ئەو لێی وەستابوو، وتی: " ئەی هاوار کە شتێکی دڵڕفێن بوو." ئینجا زەردەخەنەیەکی سەرسووڕمان ئامێزی کرد. جۆرجیش بە پەلە تەماشایەکی کردو ئەوسا گوێیەکی گرت و بایداو بە توندو تیژییەکەوە وتی: "گوێم لێبگرە هەی سەگی سەگبابی شڕوشێت. هەتا یەك نیگای ئەو سۆزانییەیش نابێ بکەیت. دەربەست نایەم چی دەڵێت و چی دەکات. پێشتر لەو جۆرە ژەهرانەم بینیووە، وەلێ هەرگیز ورنکە دانەخۆرەی بەر زیندانی لەو ژەهراوی ترم نەبینیووە. تۆ هەقت بەسەرییەوە نەبێ، لێیگەڕە."

لینی تەقەلای ئەوەی دا گوێی خۆی ڕەها بکات و وتی: " ئێ خۆمن هیچ شتێکم نەکردووە جۆرج."

"بەڵێ هیچ شتێکت نەکردووە. بەڵام کاتێ کە لەنێو دەرگاکەدا وەستابوو قاچەکانی خۆی دەنواند تۆ چاوت وەرنەگێڕا تەماشای ئەولاوە بکەیت."

"من هەرگیز شتێکی خراپم مەبەست نەبوو، بەشەرەفم هیچ نییەتێکی خراپم نەبوو جۆرج."

"دەی باشە دەی، بەڵام لێی نزیك نەکەویتەوە ها، چونکە من نەگەر لە هەموو ژیانمدا تەڵەی جرجم بینیبێ ئەوانا ئەمەیە. تۆ هیچ هەقت نەبێ با کێرلی بگرێت. ئەو خۆی بۆ ئەوە تێ هاویشتووە. دەستکێشی پڕ لە ڤازەلین،" جۆرج بە

بێزەوەرییەکەوە وتی: " هەروەها دڵنیام ئەوەی کە هەموو ڕۆژێك هێلکەی کاڵ دەخوات و لە دەرمانخانەکانیش دا دەرمانی بەهێزکەرو چالاك کەر دەکڕێت."

لێنی لە پڕێکدا هاواری لێ هەستاو وتی: " جۆرج من ئەم جێگایەم لاپەسەند نییە، ئەمە جێگایەکی شوومە. دەمەوێ ئەم جێگایە بەجێ بهێڵم."

"دەبێ تیایدا بمێنینەوە هەتا هەندێ پارەمان دەست دەکەوێت. لێنی هیچی ترمان پێناکرێت. هەرکاتێك توانیمان سێودووی ئێناکەین جێی دەهێڵین و دەڕۆین. منیش هەروەکو تۆ بەم جێگا بەدوناپەسەندە ڕازی نیم." ئەمەی وت و گەڕایەوە بۆ سەر مێزەکە و دەستە سۆلیتێرێکی تازەی بلاوکردەوەو وتی: " نەخێر منیش قەت بێرە شاد نیم و حەزیش دەکەم تا زووە ئێرە بەجێ بێڵم و بڕۆم. ئەگەر هەر تەنها چەند دۆلارێکمان لە باخەڵدا بووایە ئەوا دەکەوتینەڕێ و دەچووینە "ئەمەریکەن ڕیڤەر" و زیخ و لمان دەشووشتەوە بۆ ئەوەی زێڕی لێ جیا بکەینەوە. بەو شێوەیە ڕەنگ بوو ئەوێ ڕۆژی دوو دۆلارمان دەست بکەوێت، کێ دەزانێ، لەوانەبوو ئالتوونیش بدۆزینەوە."

لێنی بەو پەرۆشەوە بەرەو لای ئەو خۆی لارکردەوەو وتی: " دەبا بڕۆین جۆرج. دەبا لێرە بڕۆین ئێرە شوێنێکی بەدوخراپە."

جۆرجیش کوتوپڕ وتی: " دەبێ بمێنینەوە، دە بێدەنگ بە ئیتر. ئێستا پیاوەکان دێنە ژوورەوە."

لە "وۆش هاوسە." نزیکەکەوە دەنگی شۆڕە شۆڕی ئاوو شەقەشەقی دەست شۆرەکە دەهاتە بەرگوێ. جۆرج کە لە کاغەزەکانی بەردەمی ورد دەبووەوەو وتی: " ڕەنگە پێویستیمان بە خۆشووشتن بێت، جا خۆ هیچیشمان نەکردووە هەتا پیس و پۆخڵ بین."

لەوکاتەدا پیاوێکی کەڵەگەت لەنێوەندی دەرگاکەدا ڕاوەستا. ئە کاتێکدا کە قژە درێژو ڕەشە تەڕەکەی بە ئاراستەی دواوە دادەهێنا شەپقەیەکی ستێتسنی قوپاو و چرچ و لۆچی لەبن هەنگڵیدا هەڵگرتبوو. ئەویش وەکو

ئـەوانی تـر پـانتۆڵێکی شـینی جینـزو چـاکەتێکی کـورتی قوماشـی دەنیمـی لەبـەردابوو. کـاتیێ کـە شـانەکردنی قژەکـەی تـەواو کـرد چـووە ژوورەکـەوە و بـە شـکۆو سـەروەرییەکەوە هەڵسوکەوتی دەکـرد کـە هـەر تـەنها شـازادان و هونەرمەنـدانی زۆر لێهـاتوو دەیـانتوانی بـەو چەشـنە هەڵسوکەوت بکـەن. ئەگـەر چـی لێخـوڕی گالیـسکە بـوو بـەڵام وەکـو مـیرزادەی مـەززا وابـوو، دەیتـوانی دە دانـە، شـانزە دانـە، هـەتا بیـست دانـە هێـستریش بـە تاقـە هەوسـارێك بـاژوێ و ڕێبـەرییان بکـات. دەیتـوانی بـە قامـچییە درێـژو نەسـتوورەکەی خـۆی ئـەو مێشەیش بکوژێـت کـە لەسـەر شـتی هێـسترەکەیدا دەنیـشتەوە بـەبێ ئـەوەی بـەر جەسـتەی هێـسترەکەی بکـەوێت. ڕەفتـاری پڕبـوو لـە سـەلاری و مـەنگیی و ئەمەنـدەیش قـووڵ و بـەمانابوو کاتێـك کـە قـسەی دەکـرد سـەرجەم قسەکەرەکانی تـر خـامۆش دەبـوون و گوێیـان لێـی دەگـرت. بـڕوا بـە خـۆ بـوون و کاریگـەرییەکـەی هێنـدە مـەزن بـوو کـە قـسەکانی لـەبارەی هـەر بابەتێکـەوە بوونایـە، بالـەبارەی سیاسـەتەوە یـاخود لـەبارەی ئـەوین و خۆشەویـستییەوە بوونایـە دەمودەسـت دەقۆزرانـەوە. ئـا ئەمـە سـلیم بـوو، ئـەو قەتارچـییەی کـەباسمان کـرد. ڕووخـسارە شـەڕانی و دڕنـدە دیارەکـەی هەمیـشە گـەنج بـوو هـەرگیزیش بەسـاڵدا نەدەچـوو. ڕەنگـە سـیوپێنج سـاڵان یـان پـەنجا سـاڵان بـووبێ، بـەڵام هـیچ پێنـوەی دیارنـەبوو. گوێـچکەکانی لـەوە زیاتریـان دەژنـەفت کـە پێـی دەوتـرا و ناخاوتنـە کـاوەخۆ و هێورەکەشـی مانـای شـاراوەی دەگرتـەخۆ، نـەك مانـای شـاراوەی خـەیاڵ و بیرکردنـەوە، بـەڵکو مانـای شـاراوەی تێگەیـشتنێکی سـەیرو سـەمەرەتری لـە خـەیاڵ و بیرکردنـەوە هـەبوو. جووڵانـەوەی دەسـتە باریـك و زلەکانیـشی بـە جووڵانەوەی دەستی ناسکی سەماکاری پەرستگاکان دەچوو.

شـەپقە قوپـاو و چـرچ و لۆچـبووەکەی ڕێـك و ستاف کـردەوەو لەشەرێشەوە ڕێـك لـە ناوەڕاسـتەکەیدا قەمـچێکی تێخـست و خستییەوە سـەری. لـەنێو خـانووی کرێکارەکانـدا بـە میهرەبانییەکـەوە تەماشـای هەردووکیانی کـرد و بـە

نـەرم و نیانییەکـەوە وتـی: " ئـای کـە دەرەوە ڕۆشـن و گـەرم و نـاخۆش بـوو، تەنانـەت زۆر بـە دژواری دەتـوانم شـتەکانی ئێـرە ببیـنم. ئایـا ئێـوە پیـاوە تـازە هاتووەکانن؟"

جۆرجیش وتی: " هەر تا ئێستاکە هاتین."

"ئەی ئایا ئێوە فەردەی جۆیەکان دەگوازنەوە؟"

"ئا، ئەوە بڕیاری سەرکارەکەیە."

سـلیم لـەلای مێزەکـە لەبەرامبـەر جـۆرج لەسـەر سـنووقێکدا دانیـشت و لـەو دەسـتە سـۆڵێتێرە ڕامـاو وردبـووەوە کـە لـەلای ئـەوەوە نـاوەڕوو دیـاربوو. بـە دەنگێکـی زۆر ناسـك و نەرمـەوە وتـی: " هیـوادارم ئێـوە لەگـەڵ دەسـتەکەی منـدا کاربکـەن، چـونکە لـە تیپەکـەی منـدا دوو کرێکـاری گەمـژەو بێکـەڵك هـەن کـە تەنانـەت نـاتوانن گونیـەی جـۆ لـە گونیـەی گـەنم جـوێ بکەنـەوە. ئـەی ئێـوە هـیچ جۆتان گواستووەتەوە؟"

جـۆرجیش وتـی: " بـەڵێ، بێگومـان کواسـتوومانەتەوە، بـەڵام هێنـدەیش بـە توانـانیم هـەتا جـاری بـۆ بـدەم، وەلـێ ئـا ئـەو دئـوە سـەگبابەی ئـەوێ هـەر خـۆی بەتـەنیا دەتوانێ ئەمەندە دانەوێڵە هەڵبگرێت کە مەحاڵە دوو کەس بتوانن هەڵی بگرن."

لێنـی کـە بـە درێـژایی کاتەکـە بـە چـاوەکانی لـەملاوە بـۆ ئـەولا جێپێـی دەمەتەقێکـەی هـەڵگرتبوو، بـە بیـستنی ئـەو ستایـشە خەندەیـەکی ڕەزامەندانـەی هـاتێ. سـلیم لەبـەر ئـەو ستایـشەی کـە جـۆرج بـەلێنی دابـوو بـە چـاوێکی پـڕ لـە نیحتوبارانە تەماشای جۆرجی کرد.

بەسـەر مێزەکـەدا چـەمایەوە و سووچـی کاغـەزێکی لەبەردەسـتی خۆیـدا قۆستەوەو وتی: " ئەی کوڕینە ئێوە بۆ هەموو شوێنێك بەیەکەوە دەچن؟"

دەنگـی ئەمەنـدە دۆسـتانە بـوو بـەبی ئـەوەی پـەیجۆری متمانـە بکـات بـووە هۆی متمانە پەیدا کردن.

جۆرجیش وتی: " بەڵێ، ئێمە لەو جۆرەین کە بە تەنگ یەˊەوە دێین."
ئینجا بە پەنجەکەڵەی ئیشارەتی بۆ لینی کردو بەردەوام بوو: " وریاو زرنگ نییە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەیشدا کارگەرێکی بێهاوتایە و پیاوێکی تا بڵێی ئێسک سووك و خۆش خووە، بەلاّم وریاو زرنگ نییە. من زۆر لەمێژە دەیناسم."
سلیم تەماشای جۆرجی کردو تێبڕوانی و بە حەپەسانێکەوە وتی: " ئەو پیاوانە زۆر نین کە پێکرا بۆ هەموو شوێنێك دەچن، نایشزانم بۆچی. لەوانەیە هۆیەکەی بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە سەرلەبەری خەڵکی ئەم دونیا شەڕانگێزە لەیەکتری دەسلەمێنەوە."
جۆرجیش وتی: " باشتروایە لەگەڵ ئەو کەسەدا بگەڕێیت کە باش دەیناست."
لەوعانەدا پیاوێکی کەتە وبەهێزی تەنگەستوور هاتە نێو خانووی کرێکارەکانەوەو دیاربوو کە بەهۆی چەندین دەست لە خۆدان و ئاو بە خۆداکردن هێشتا سەروقژی ناوی لێ دەچۆڕایەوەو وتی: " هەلۆو سلیم." و پاشان ڕەق ڕاوەستاو لە جۆرج و لینی ڕاما.
سلیمیش بەشێوەی پێشکەشکردن و ناساندن وتی: " ئەمانە ئێستا هاتوون." پیاوە کەتە و زلەکەیش وتی: " خۆشحاڵم بە ناسینتان. من ناوم کارلسۆنە."
"من جۆرج میلتۆنم و ئەویش لینی سمۆڵە."
کارلسۆن هەمدیس وتییەوە: " خۆشحاڵم بە ناسینتان. بەڕاستی سمۆڵ(١) هیچ بە سمۆڵ ناچێت." ئینجا بەو تەلفیزەیەی خۆی قریوەی هاتێ و بەردەوام بوو: " نا بەهیچ کلۆجێك بچووك نییە." ئەمەی دووبارە کردەوەو وتی: "

---

(١) Small: واتە بچووك.

بەڕاست سلیم دەمویست لێت بپرسم، سەگەکەت چۆنە؟ ئەم بەیانییە تەماشام کرد لە ژێر گالیسکەکەتدا نەمبینی."

سلیمیش وتی: " دوێنێ شەو بەچکەی بوو، نۆ بەچکەی بوو. بەڵام من یەکسەر چواردانەیانم لە ئاودا خنکاند، چونکە پێی ناکرێ شیر بەو هەموو بەچکەیە بدات."

"کەواتە پێنج توولە سەگی ترت ماونەتەوە، ها؟"

"بەڵێ، پێنج دانە ماونەتەوە. من گەورەترینیانم بۆ خۆم گلدایەوە."

"پێت وایە چ بەرە سەگێك دەکەونەوە؟"

سلیمیش وتی: " نازانم، بەڵام وای مەزەندە دەکەم هەر لە چەشنی سەگی گەلە دەربچن. چونکە کاتێ کە بەکەڵ بوو لەم دەوروبەرەدا هەر لەم جۆرانە هەبوون."

کارڵسۆن لە قسەکردن سەرومڕبوو: " کەواتە پێنج توولەت هەیە، ها. ئەی هەر هەموویان بۆ خۆت رادەگری؟"

"نازانم. بۆ ماوەیەك دەبێ رایانبگرم هەتا شیری "لوولوو" بنۆشن."

ئینجا کارڵسۆن بە غایەلەوە وتی: " دە کەواتە گوێم لێبگرە سلیم. ئەمە ماوەیەکە بیر دەکەمەوە. ئەو سەگەی کاندی بێزادە پیربووە و تەنانەت بە زۆرەملێ پێی دەکرێت بڕوات و بۆنێکی فرە بۆگەنیشی لێوە دێت. هەر کاتێکیش کە دێتە ناوخانووی کرێکارانەوە ئەوا ئیتر بۆ دوو سێ رۆژ ئەو بۆنە بۆگەنەی هەردەمێنێتەوە. بۆچی دنەی کاندی نادەیت گوللەیەك بەسەگەپیرو کەنەفتەکەی خۆیەوە بنێت و یەکێك لەو توتەڵانەی بدەیتێ گەورەی بکات؟ من لە دوورایی میلێکەوە بۆنی ئەو سەگە دەکەم. بەکەڵك نایەت، دانی نەماوەو نیمچە نابینایە و هیچیشی پێ ناخورێت. کاندی هەر شیری دەرخوارد دەدات. هیچ شتێکیشی پێ ناجاورێت."

جۆرج بە ئەبلەقییەکەوە چاوی بڕیبووە سلیم. ناگەهان، لە دەرەوەڕا زەنگە سێگۆشەییەکە کەوتە لێدان، سەرەتا هێواش و لەسەرخۆ، دواتریش خێراو خێراتر لێیدا هەتا ئەو لێدانەی لەنێو دەنگی لێدانێکی یەکنەوای بالآدەستدا ڕەوییەوە. ئینجا وەکو چۆن لە ناکاودا دەستی پێکردبوو هەر ئاوایش لە ناکاودا ڕەوییەوە. کارلسۆن وتی: " ئەوەتا دیسان زەنگ لێیدایەوە."

لە دەرەوەیشدا، هەڵپەوپەلاماری دەنگەدەنگی ئەو تاقمە پیاوە بیسترا کە بەویێدا ڕابووردن.

سلیمیش شکۆمەندانەو لەسەرخۆ هەستاو وتی: " کوڕگەل وا چاکە هەتا شتێك ماوە بۆ خواردن ئێوەش بێن. ئەگینا پاش دوو دەقیقە هیچ نامێنێتەوە."

کارلسۆن هاتە دواوە بۆ ئەوەی ڕێگا بە سلیم بدات پێشیبکەوێت، ئەوسا هەردووکیان لە دەرگاکەوە ناودیوو بوون و ڕۆیشتن.

لێنی گەنێك بە خرۆشانەوە تەماشای جۆرجی دەکرد. بەلآم جۆرج کاغەزەکانی تێك و پێکدا و کەڵەکەیەکی پەرشوبلاَو وشێواوی داناو وتی: " بەڵێ! گوێم لێی بوو لێنی. خەم مەخۆ یەکێکی لێ داوا دەکەم."

لێنیش بە جۆش و خرۆش و شادییەکەوە قیژاندی و وتی: " یەکێك بێت قاوەیی و سپی."

"دەتۆ هەستە دەی بابڕۆین خواردن بخۆین. نازانم ئاخۆ دانەیەکی قاوەیی و سپی هەیە یان نا."

لێنی لەسەر چەرپایەکەی خۆی تەکانی نەخواردو وتی: " جۆرج هەر ئێستاکە پێی بڵێ، هەتا هی تریان لێ نەکوژێ."

"دەی باشە. ئێستاکە بابڕۆین، دەی هەستەرە سەرپێ."

لێنیش بەسەرچەرپایەکەیدا تلی خواردەوەو کەوتە سەرپێ، ئەوسا هەردووکیان بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتن. هەر کە گەیشتنە بەردەرگاکە، کێرلی بە

پرتاو خۆی کرد بە ژووردا و بە توورەییەوە لێی پرسین: " لەم دەوروبەرەدا کچێکتان بینیووە؟"

جۆرجیش بەخەم ساردییەکەوە وتی: " دەوروبەری نیو سەعات بەر لە ئێستا بینیم."

"ئێ، ئەی لێرە چی دەکرد؟"

جۆرجیش بە هێمنی و حەجمان گیرانە سەیری پیاوە شێتگیرە چکۆلانەکەی دەکردو ئەوسا بە سووکییەکەوە وتی: " وتی.. بەدوای تۆدا دەگەڕێت."

کێرلی بەڕاستی وەك بڵێیت یەکەم جارە چاوی بە چارەی جۆرج دەکەوێت. لەگەڵ تەماشا کردنیدا دیدەکانی سوورهەڵگەڕابوون، لەهزری خۆیدا ئەندازەی درێژی و پانییەکەی لێکدەدایەوەو بە وردی تەماشای قەدو باڵا ڕێکوپێکەکەی و هێزو پتەوییەکەی دەکردو لە ناکامیشدا پرسی: " ئەی بەچ لایەکدا ڕۆیشتن؟"

جۆرجیش وتی: " نازانم، کاتێ کە ڕۆیشت تەماشام نەکرد."

کێرلی مۆڕەیەکی توندی لێکردو نینجا وەرچەرخاو بە پەلەپڕووزێ دەرچووە دەرەوە. جۆرجیش بە لێنی وت: " دەزانی چی لێنی، ترسی ئەوەم لێ نیشتووە کە من خۆم لەگەڵ ئەم کەڵلەپووچە زۆڵەدا گیرۆدە بم. ئەی خوای گەورە! تا بڵێی ڕقم لێیەتی و دەیبێزم. دەی با بڕۆین. ئەگینا هیچ شتێك نامێنێتەوە بیخۆین."

چوونە دەرەوەو تیشکی خۆریش هەر تەنها بەقەدەر هێڵێکی باریك لەژێر پەنجەرەکەدا مابووەوە. دوور بە دووریش دەکرا تەقە تەقی قاپ و قاجاغ ببیسترێ.

پاش ئەوە بە ماوەیەکی کورت سەگە بەساڵداچووەکە بە شەلەشەل لە دەرگا وازەکەوە هاتە ژوورێ. بە چاوە کزو نیمچە کوێرەکانییەوە بەملاو بەولادا هەڵێروانی و بەمەشەمش بۆنی ئەو ناوەی کردو ئەوسا پاڵکەوت و سەری خستە نێو هەردوو چنگەکانی پێشەوەی. کێرلی هەمدیسان لەبەر دەرگاکەدا دەرکەوت، لەوێ وەستاو چاوی بڕییە نێو ژوورەکە، سەگەکە سەری

هەڵبڕی، بەڵام هەر کە کیژۆڵەی دەرپەڕییە دەرەوە ئەویش سەرلەنوێ سەرە بۆرو خۆڵەمێشییەکەی ئەوی کردەوەو خستییەوە سەرچنگەکانی پێشەوەی لەسەر زەوییەکە داینا.



ئەگەر چی ڕۆشنایی ئێوارە لەمیانی پەنجەرەکانی خانووی کرێکارانەوە دەردەکەوت، بەڵام ژوورەوە هەر تاریك بوو. لەمیانی دەرگا ناوالەکەشەوە جارناجارێ دەنگی زرم و کوت و تەقە تەقی بەنالْ گەمەکردن دەبیسترا و جارناجاریش سەدای دەنگەکان ڕەزامەندانە یاخود گاڵتەئامێزانە بەرزدەبووەوە.

سلیم و جۆرج پێکرا هاتنە نێو خانووی تاریکی کرێکارانەوە. سلیم دەستی بۆ سەر مێزی یاری کاغەزێنەکە بردو لەمپاکارەباییە سەر بە کڵاوە تەنەکەییەکەی داگیرساند. دەمودەست مێزەکە بە ڕووناکییەکی بێ وێنە درەوشایەوەو سەرکڵاوە تەنەکەییەکەیش ڕاستەوخۆ ڕۆشناییەکەی بەرەو خوارەوە دەدایەوەو هێشتایش سووچ و قوژبنی خانووی کرێکارانی لەنێو نوتەکیدا دەهێشتەوە. سلیم لەسەر سنووقێکدا دانیشت و جۆرجیش لەبەرامبەریدا جێگای خۆی گرت.

سلیم وتی: " باوەڕبکە ئەوە شتێکی ئەوتۆ نەبوو، هەرچی چۆنێك بێت ناچاربووم و دەبوایە زۆربەیان لەناوبەرم. ئەوەش ناهێنێ بۆ ئەوەی سوپاسم بکەیت."

جۆرج وتی: " ڕەنگە بۆتۆ هیچ نەبووبێ، بەڵام بۆ ئەو تا بڵێی شتێکی بێهاوتابوو. ئەی خودای گەورە، نازانم چۆن چۆنی ڕازی بکەین لێرەدا بخەوێت. چونکە ئەو حەز دەکات ڕێك لە تەویلەکە لەگەڵیاندا بخەوێت. بێگومان کێشەیشمان ئەوەدا دەبێت کە ناتوانین دووری بخەینەوەو نەهێڵین لەو تەویلەیەدا لەگەڵ ئەو توتکە سەگانە بخەوێت."

سلیم دووپاتی کردەوەو وتی: " باوەڕبکە ئەوە شتێکی ئەوتۆ نەبوو، بەلاّم بێگومان تۆ لەسەر هەق بوویت و لەو بارەیەوە ڕاستت وت. لەوانەیە ئەقلّی تەواو نەبیّ، بەلاّم من هەرگیز نیشکەری وام نەدیتووە. لەعنەتییە خەریکبوو بە گواستنەوەی جۆ هاوکارەکەی بکوژێت. هیچ کەسێك نییە بتوانیّ شان لە شانی بدات. ئای خودای مەزن و بێهاوتا من هەرگیز پیاوێکی ئاوا بەهێزو توانام نەدیتووە."

جۆرجیش بەفیزو شانازییەکەوە وتی: " هەر تەنها ئەوە بە لێنی بلّیّ کەچی بکات و ئەویش بە جوانترین شێوە ئەنجامی دەدات هەرتەنها ئەگەر پێداویستی بە ڕەچاوکردن و زانین نەبێت. ئەو خۆ بە خۆ ناتوانیّ بیرلە ئەنجامدانی هیچ شتێك بکاتەوە، بەلاّم بێگومان هەرچ فەرمانێکی بدەیتیّ بیّ سێو دوو بە ئەنجامی دەگەیەنێت."

لە دەرەوەدا، دەنگی تەقەتەقی ئەو نالانە دەهاتنە بەرگویّ کە دەیانکێشا بەسەر سنگێکی ئاسنداو هەندێك دەنگ و قیژەی بچکۆلانەی پڕخۆشی تریشی دەبیستران. سلیمیش بۆ ئەوەی ڕۆشناییەکە نەکەوێتە سەرو سیمای نەختێك گەڕایە دواوە و وتی: " سەیرە چۆن چۆنی تۆو ئەو هێندە دۆستن و خوتان پێکەوە گرتووە." ئەمە داوەتی هێمنانەی سلیم بوو تا دلّنیایی زیاتری پێببەخشیّ و بیهێنێتە قسە. جۆرجیش بە چەشنێکی بەرگریکارانە لێی پرسی: " جا چ شتێك لەوەدا سەیرو سەمەرەیە؟"

"ئۆو، نازانم چی بلّێم. وەلیّ پیاوان هەرگیز ئەمەندە پێکەوە پابەند نین و ئەملاو ئەولا ناکەن. بە دەگمەنیش دوو پیاوم نەبینیووە ئەمەندە پابەندبن و پێکەوە بگەڕێن. خۆ تۆ دەزانی کرێکارەکان چۆنن، هەر کە دێنە سەرکارو جێخەوەکەیان دەستەبەر دەکەن و یەك مانگ کاردەکەن ئەوسا بێزار دەبن و واز لە کاردەهێنن و تاق و تەنیا دەڕۆن. قەتاوقەتیش بەوە ناچێت کە گرنگی بەهیچ کەسێکی تر بدەن. بە شێوەیەك لە شێوەکان دۆستایەتی و پەیوەندی

پیاوێکی شێت و بێ مێشکی وەکو ئەو و پیاوێکی بچووکی زیرەك و ئاقڵی وەکو تۆ بەسەیرو عەجایەب دەچێت."

جۆرجیش وتی: " نا، شێت و بێ مێشك نییە، ئەگەرچی زۆر حەپۆل و کەودەنە، بەڵام شێت و بێ مێشك نییە. منیش هێندە زیرەك و ئاقڵ نیم، ئەگەر نا بۆ وەتاغ و خواردن و پەنجا دۆلار ئەو هەموو فەردە جۆیەم نەدەگواستەوە. ئەگەر من بە ئاوەز بوومایە، یاخود ئەختێك زرنگ بوومایە، ئەوا پارچە زەوییەکی بچکۆلانەی خۆمم دەبوو، دەغڵ و دانی خۆمم وەدەست دەهێنا، نە قەبێڵی ئەوەی ئەو هەموو ئیشە بکەم و ئەوەشم دەست نەکەوێت کە لە زەوییەوە دەردەچێت و پێدەگات." جۆرج بێدەنگ بوو. بەڵام دەیویست لە دوان سەرومرپێت. سلیمیش بۆ ئەوە نە دنەی داو نە ساردیشی کردەوە.

هەرئاوا بەبێ دەنگی، ئامادەی گوێرادێران دانیشتبوو. جۆرجیش لە ئاکامدا درێژەی دایێ و وتی: " دۆستایەتی و پەیوەندی من و ئەو شتێکی سەیرو سەمەرەی تیاییە. من و ئەو هەردووکمان لە "ئۆبۆرن" لە دایکبووینە. من پوورە کلارایم دەناسی. لێنی هێشتا منداڵێکی ساوا بوو کە ئەو گرتییە خۆ و پەروەردە و گەورەی کرد. ئەو دەمەی پوورە کلارایشی کۆچی دوایی کرد، لێنی هات بۆ ئیشکردن منی کرد بە یاوەری خۆی. ئێمەیش ئیتر پاش ماوەیەکی کورت بەیەك ڕاهاتین."

سلیمیش وتی: " ئممم"

جۆرج تەماشای سلیمی کردو چاوەپڕ ئۆقرەو بە چاوی خوداچووەکانی بینی کە لەسەر ئەودا سەقامگیربوون و وتی: " سەیرە، جاران کەیفوسەفای دنیام لەگەڵدا دەکرد. فێرببووم قەشمەریم پێدەکردو دەمکردە گاڵتەجاڕ، چونکە زۆر لەوە گەمژەتر بوو کە بتوانێ ئاگای لە خۆی بێت. بەڵام زۆر لەوەیش گەمژەتربوو درك بەوە بکات کە گاڵتەو مەزاقی پێکراوە. پێیم ڕادەبواردو کەیفوحاڵم دەکرد. ئەوەیش وای لێکردبووم لەتەنیشتی دا زۆر زرنگ و وریا

دیارم. ئەی چۆن، هەرچی شتێکم پێ بوتایە ئەنجامی دەدا. ئەگەر پێم بوتایە بەسەر هەڵدێرو کەندەلانێکدا برۆ، بێ چوون و چەرا بەسەریدا دەرۆیشت. دوای ئەوە ئیتر بە ماوەیەك چیدی لەو گاڵتانە کەیف و خۆشیم نەدەبینی. ئەویش لەبارەی ئەو شتانەوە هەرگیز رقی هەڵنەدەستاو تووڕە نەدەبوو. لێم دەدا، تا بڵێی خراپ و زاڵمانە لێم دەدا، ئەگەر جێی ئەو دەیتوانی هەر بە دەستەکانی هەرچی ئێسك و پرووسکی جەستەم هەیە وردوخاشی بکات، بەلام قەت تەنانەت پەنجەیەکیشی لێ هەڵنەگرتم.'' دەنگی جۆرج خەریکبوو تۆنی دان پیادانانی دەگرتە خۆو وتی: " جا با پێت بڵێم چی وای لێکردم دەستبەرداری ئەو کارانەبم. رۆژێکیان کۆمەڵە پیاوێك لەدەوروبەری رووباری ساکرەمێنتۆدا راوەستابوون و منیش لەو ئانوساتەدا زۆر هەستم بە لێهاتوویی کرد. ئاورم لە لێنی دایەوەو پێم وت: " دەی لێنی خۆت باوێژە ناو ئاوەکەوە." و ئەویش بەبێ تێفکرین خۆی هاویشتە ناو ئاوەکەوە و نەیشی دەزانی مەلە بکات. بەرلەوەی بتوانین رزگاری بکەین خەریکبوو نقووم بێت. دواتر لەگەڵ مندا زۆر خۆش رەفتار و رێکوپێك بوو چونکە من رامکێشابووە دەرەوەو رزگارم کردبوو. بە تەواوی ئەوەیشی لەبیرچبووەوە کە من پێم وتبوو خۆی هەڵداتە ناو ئاوەکەوە. ئیتر لەو رۆژەوە بیرای بیر شتێکی نەوتۆم ئەنجام نەداوە."

سلیم وتی: " پیاوێکی نایابە. پیاو بۆ ئەوەی ببێتە کەسێکی نایاب و رێکوپێك پێداویستی بەهەست و هۆشێکی زۆر گەورە نییە. پێم وایە هەندێجار پێچەوانەکەشی هەر راستە. بۆ نموونە تەماشای پیاوێکی بەهزر و زیرەك بکە زۆر بە دەگمەن کەسێکی سەددەرسەد نایاب و رێکوپێکە."

جۆرج کاغەزە پەرشوبلاوەکانی رێك خستەوەو کەوتە دانانی دەستەی سۆلێتێرەکەی. لە دەرەوەشدا نالەکان دەکەوتنە سەر زەوی و تەپەتەپیان دەردەکرد و رۆشنایی هەتاوی ئێوارەیش هێشتا هەر چوارگۆشەی پەنجەرەکانی رووناك دەکردەوە.

جۆرج وتی: " من هیچ کەسێکم نییە. ئەو پیاوانەم دیتووە کە بە تاق و تەنیا بە مەزراکاندا دەگەڕێن و کاردەکەن. ئای کە شتێکی بێهوودە و ناخۆشە. هیچ کەیف و خۆشییەکیان نییە. پاش ماوەیەکی دوورودرێژ دەبنە خەڵکێکی خراپ و شەڕانگێز. وایان لێ دێت کە هەموو کاتێك حەز بە ئانەوەی شەڕوشۆڕبکەن."

سلیم لەگەڵیدا هاوڕابوو وتی: " ڕاستەکەی، بەدکارو هیچ و پووچ دەردەچن. وایان لێ دێت نایانەوێ لەگەڵ هیچ کەسێکا بدوێن."

جۆرج وتی: " بێگومان زۆربەی کات لێنی دەبێتە بارێکی زۆر قورس و نالەبار، بەلام کاتێك بەهاودەمی و دۆستایەتی کەسێك ڕادێیت ئیتر ناتوانیت لەکۆڵی خۆتی بکەیتەوە."

سلیم وتی: " بەڕاستی لێنی خراپ و شەڕانگێز نییە، دەیشزانم کە هیچ خراپییەکی پێوە دیارنییە."

"بێگومان خراپ نییە. بەلام لەبەرئەوەی زۆر دەبەنگ و بێ ئاوەزە بەردەوام دەکەوێتە نێو ئاستەنگەوە. وەکو ئەوەی کە لە وید دا ڕووی دا..." ئینجا بێدەنگ بوو، لە کاتی هەڵدانەوەی کاغەزێکدا بێدەنگ بوو. ترسی لێ نیشت و بە وردی تەماشای سلیمی کردو وتی: " خۆ تۆ ئەمە لای کەس نادرکێنی وانییە؟"

سلیمیش بە هێمنییەکەوە پرسی: " چی کرد لە وید؟"

"بەکەس نالێیت؟... نا، بێگومان دەزانم بە کەس نالێیت."

سلیم هەمدیس پرسییەوە: " چی کرد لە وید؟"

"چی بڵێم. جارێك کچێکی کراس سوور لە بەری بینی. لەبەرئەوەی کە سەگبابێکی گەمژەی ئاواشە، حەزدەکات دەست لە هەموو ئەو شتانە بدات کە بە دڵین. هەر تەنها دەیەوێ دەستی لێ بدات و هیچی تر. بۆیە کاتێ کە دەستی درێژکرد بۆ ئەوەی دەست ئالەو کراسە سووورەبدات کچەکە کەوتە قیژاح و

هـاوارکردن و ئـەوەیش بـە تـەواوەتی سـەری لـە لێنـی شـێواندو تونـدتر کراسـەکەی گـرت، چـونکە ئـەوە ئـەو تاقـە شـتە بـوو کـە ئـەو دەیتـوانی بیرلـە کردنـی بکاتـەوە. کچەکەیش هـەر بـەردەوام بـوو لـە قیژەقیـژو فیـزاح کـردن. منـیش هـەر نـەختێك لـەوێوە دووربـووم و گوێبیـستی سـەرتاپای هاواروقیـژە قیژەکـە بـووم و بـەراکردن بـۆ لایـان چـووم، بـەلاٌم لێنـی نەمەنـدە تۆقیبـوو هیـچی پێنـەدەکرا ئـەوە نـەبێ کـە تونـدتر کراسـەکەی بگریـێت. منـیش بـەدار تـەیمانێك کەوتمـە لێـدانی سـەرو پۆتـەلاکی تـاوای لێبکـەم بـەری بـدات. وەلێ تـرس و سـامەکەی هێنـدە گـەورەبوو نەیـدەتوانی ئـەو کراسە بەرەلاٌ بکات. هەروەکو دەشزانی کە ئەو نەعنەتییە چەند بەهێزە."

چـاوەکانی سـلیمیش مـەنگ و بـێ تروکـە بـوون. زۆر بـە هێواشـی سـەری راوەشاندو وتی: " ئێ، چی رووی دا؟"

جۆرج زۆر بە ناگاو دیقەتەوە کاغەزە سۆلیتێرەکەی نەبەردەمی خۆی ریزکردو وتی:

"چـی رووی دا، کـچەکە رایکـردە بنکـەی پـۆلیس و پێـی وتـن بـە تـوێزی لاقـەکراوە. پیاوەکـانی ویـدیش مەفرەزەیـەکیان پێـك هێنـا بـۆ ئـەوەی لێنـی بگـرن و هەلٌیواسـن. بۆیـە ئێمـەیش بەناچـاریی لـەنێو چـاڵی ئاودێرانـدا دانیـشتین و تـەواوی ئـەو رۆژەمـان لـەژێر ئـاودا بەسـەر بـردو هـەر تـەنها سـەرمان لـە پـەنای چـالەکەوە دەردەکـردە دەرێ. هـەر ئـا ئەو شەوە بە پەلەپرووزێ دەرکەوتین و ئەوێمان بەجێ هێشت."

سـلیم گاڤێـك بـە بێـدەنگی دانیـشت و لـە ناکامـدا پرسـی: " ئـەی خـۆ هـیچ عەزیەتی بە کچەکە نەگەیاند، ها؟"

"ئـا.. بێگومـان عەزیـەتی نـەدا. هـەر تـەنها زنـۆقی بردبـوو هیـچی تـر. تەنانـەت ئەگـەر پـەلاماری منیـشی بدابایـە زنـۆقم دەچـوو. وەلێ هـیچ ئـازارێکی پـێ نەگەیانـد. هەرتـەنها دەیویـست دەسـت ئالـەو کراسـە سـوورە بـدات، هـەروەکو چۆن حەزدەکات هەموو وەختێك ئەو توتەلٌە سەگانە نەوازش بکات ئاوا."

سـلیم وتـی: " لێنـی پیـاوێکی بـەد نییـە، چـونکە مـن دەتـوانم لـە دووریـی میلێکەوە پیاوی بەدوخراپ بناسم."

"بێگومـــان وایـــە، پیـــاوێکی خـــراپ نییـــە و هـــەموو ئـــەو شـــتانەیش ئـــەنجام دەدات کـــە مـــن..." لـــەو کاتـــەدا لێنـــی لـــە دەرگاکـــەوە هاتـــە ژوورێ. پـــاڵتۆ دەنیمـــە شینەکەی بەسەر شانەکانیدا دابوو، بە کوورە کوورەوە هەنگاوی دەنا.

جۆرج وتی: "هەلەو لێنی. تۆ ئێستاکە پێم بڵێ ئەو توتەڵە سەگەت بە دڵە؟"

لێنـــیش بەهەناســـە ســـوارییەوە وتـــی: "هـــەروەکو ئـــەوەی کـــە دەمویـــست قاوەیی و سپییە."

ئینجـــا ڕاســـتەوخۆ بـــەرەو لای چـــەرپایەکەی خـــۆی ڕۆیـــشت و لەســـەریدا ڕاکـــشاو ڕووی کردە دیوارەکەو ئەژنۆکانی بەرەو خۆی هەڵکشاندەوە.

جۆرج زۆر بە ئەسپایی کاغەزەکانی داناو بەدەنگێکی تیژ وتی: "لێنی."

لێنیش ملی خۆی سووڕاندەوەو لەسەر شانییەوە تەماشای کردو وتی:

"ها، چیت دەوێ جۆرج؟"

"من پێم وتی نابێ ئەو توتکە سەگە بهێنیتە ئێرە."

"توتکە سەگی چی، جۆرج؟ توتکە سەگم پێ نییە."

جـــۆرج بـــە خێرایـــی چـــووە لای و شـــەپیلکی گـــرت و ســـووڕاندییەوە. دەســـتی بـــۆ نێـــو ئـــامێزی درێـــژ کـــردو توتەڵـــە بـــچووکەکەی گـــرت و لـــەلای ســـکییەوە هێنایـــە دەرەوە کەلێنی تیایدا مەلاسی دابوو.

لێنی بەپەلە هەستاو وتی: "جۆرج، بیدەرەوە پێم."

جـــۆرجیش وتـــی: "هـــەر ئێـــستا هەســـتەو دەســـتبەجێ ئـــەم توولەیـــە بـــۆ لانەکـــەی خـــۆی بـــەرەوە. دەبـــێ لەگـــەڵ دایکیـــدا بخـــەوێت. ئایـــا تـــۆ دەتـــەوێ بیکوژیـــت؟ دوێنـــێ شـــەو لـــە دایکبـــووە و ئـــەوەتانێ تـــۆیش لەلانەکـــەی دەرت هێناوە. بیگێڕەوە شوێنی خۆی ئەگینا بەسلیم دەڵێم نەتداتێ."

لێنـیش بـە پاڕانـەوە و تکـا کردنـەوە دەسـتەکانی ڕاگـرت و وتـی: "جـۆرج، بیـدەرەوە پـێم. دەیبەمـەوە جێگاکـەی خـۆی. خـۆ مـن نەمدەویـست هـیچ ئـازاری بـدەم، جـۆرج بەشەرەفم نەمدەویست ئازاری بدەم. هەر تەنها دەمویست نەختێك نەوازشی بکەم."

جۆرج تووتکەکەی دایە دەستی و وتی: "دە باشە دەی. خێرا بیبەرەوە جێگاکەی خۆی و جارێکی تریش مەیهێنەرە دەرەوە. ئەگینا هەر ئەوەندە دەزانی کوشتوتە."

ئەوسا لێنی بە هەڵەداوان لە ژوورەکە دەرچووە دەرێ و رۆیشت.

سلیم لە جێی خۆی نەجوولابووەوەو چاوە ئارامەکانی هەر بە دوای لێنییەوە بوون هەتا لە دەرگاکەوە چووە دەرێ و وتی: "خۆ هەر دەڵێی زارۆڵەیە. توخوا وانییە؟"

"با، هەر رێك بە زارۆڵە دەچێت. هەروەك منداڵ بێوەیە. هەر تەنها ئەوە نەبێ کە ئەم بەهێزترە و هیچی تر. دڵنیام کە ئەمشەو نایەت لێرە بخەوێت. رێك لەتەنیشت ئەو سنووقەی نێو تەویلەکەدا دەخەوێت. ئێ دە لێیگەرێ چی دەکات بابیکات. خۆ ئا لەوێ زیان بەهیچ کەسێك ناگەیەنێت."

ئیدی تەقریبەن دەرەوە تاریك هەڵگەرابوو. کاندیە پیری خزمەتکار هاتە ژوورەوەو بۆ لای چەرپایەکەی خۆی رۆیشت و سەگە پیرە زوورهانەکەشی بە دژواری و زەحمەتکێشانەوە بە دوای دا دەرۆیشت.

"هەڵەو سلیم. هەڵەو جۆرج. ئەرێ هیچتان یاری ناڵ ناڵێنتان نەکرد؟"

سلیمیش وتی: "من حەز ناکەم هەموو شەوێك یاری بکەم."

کاندی بەردەوام بوو وتی: "کامتان قومێك وسکیتان هەیە؟ هەرچی هەناوم هەیە ژان دەکات."

سلیم وتی: "من نیمە. سەرباری ئەوەیش کە ژانە سیپەلاکم نییە، بەڵام ئەگەر هەمبوایە خۆم دەمخواردەوە."

کاندی وتی: "ژانە سکێکی زۆر خراپم هەیە، هەر ئەو شێلمە نەفرەتییانە دووچاری ئەوەیان کردم. بەرلەوەیش کە بیانخۆم دەمزانی وام لێ دەکەن."

کارلسۆنی تەنگەستوور لە حەوشە نوتەك و تارەکەوە هاتە ژوورەوەو بەرەو لایەکەی تری خانووی کرێکاران رۆیشت و لەمپا سەر بە کلاوەکەی تری داگیرساندو وتی:

"خۆ ئێرە لە دۆزەخ تاریکترە. بەڵام لێ دا چۆن ئەو قولەرەشە ئەو ناڵانە تێدەگرێت."

سلیمیش وتی: " ئەو قولەڕەشە زۆر بە سەلیقەیە."

کارلسۆنیش وتی: " ڕاستە زۆر بە سەلیقەیە، تەنانەت فرسەتی هیچ کەسێکیش نادات بیباتەوە.." پاشان ڕاوەستاو پشوویەکی داو بەردەوامبوو لە پشوودان، ئینجا لە پیرە سەگەکەی ڕوانی و وتی: " ئەی خودای گەورە، ئەو سەگە چەند بۆن بۆگەنێکی پیسی لێدێت. کاندی بیبەرە دەرێ! باوەڕناکەم هیچ شتێك هەبێ نەوەندەی پیرە سەگێك بۆنی بۆگەنی لێوە بێت. دەی بیبەرە دەرەوە."

کاندی تلێکی بەرەو لێواری چەرپایەکەی دا و خۆی گەیاندە پیرە سەگەکە و بە نەسپایی دەستی پیادا مالی، ئینجا داوای لێبووردنی کردو وتی: " هێندە لە دەوروبەری بوومە لەبەر ئەوەیە کە هەرگیز تێبینی ئەوەم نەکردووە کە چ بۆن بۆگەنێکی لێوە دێت."

کارلسۆنیش وتی: " باشە، بەلام من لە توانامدا نییە بەرگەی ئەو بگرم، ئەو بۆگەنییە هەر لێرە لەنگەر دەگرێ هەتا پاش ئەوەیش کە ئێرە بەجێ دەهێلێ هەر دەمێنێتەوە."

ئەوسا بە هەنگاوە شێنە و قورسەکانی لەسەگەکە نزیك بووەوەو چاوی تێبڕی، دواجار وتی: " ددانی نەماوەو ڕۆماتیزمیش هەموو ئازای گیانی ڕەق هەلگەڕاندووە. بۆ تۆ هیچ کەلکێکی نییەو بۆ خۆیشی بەکەلك نایەت. ئەی ئیتر بۆچی نایکوژی؟"

پیرەمێردەکەیش نارەحەتانە خۆی کرژکردەوەو وتی: " ئەوە تۆ چی دەلێی! زۆر دەمێکە ئەو سەگەم هەیە. هەر لەو کاتەوە کەتوتەلە بوو. لەگەل ئەودا گەلەی مەڕو مالاتم دەلەوەڕاند" ئەمجا بە هەواو شانازییەکەوە وتی: " ئێستا ئیتر بیر لەوە ناکەنەوە کەتەماشای دەکەن، هەر لە ئاوا دەبیینن، بەلام سوێند دەخۆم کە ئەو باشترین سەگی گەلە بوو کە لە هەموو ژیانی خۆمدا دیتبێتم."

جۆرج وتی: " لە ویـد دا پیاوێکم دەناسی سەگێکی "ئێردەیل" ی هەبوو دەیتوانی گەلە بلەوەڕێنێ. لە سەگەکانی ترەوە فێری ئەوە ببوو."

بـــەڵام کارڵـــسۆن پـــەژیوان نەدەکرایـــەوەو پـــەیگیربوو، وتـــی: " گـــوێبگرە کانـدی. ئـەم پـیرە سـەگە خۆیـشی لەعـەزابێکی بـی پـسانەوەدایە. باشـتر وایـە بیبەیتـە دەرەوەو فیـشەکێك بـە پۆقەتـەی سـەرییەوە بنێـی.." ئینجـا خـۆی چـەماندەوەو ئـەو جێگایـەی دیـاری کـرد و وتـی: " ڕێـك نەلـەوێی بـدە. ئـێ خـۆ هەرگیزیش پەی بەوە نابات کەچی لێیداوە."

کانـدی بـە ناشـادییەکەوە لـە دەورو زێـواری روانـی و بـە نەرمییەکـەوە وتـی: " نا، نا... جورئەتی ئەوەم نییە. گەلێك وەختە ئەو سەگەم لایە، ناتوانم."

کارڵـسۆنیش بـە پێداگرییـەوە وتـی: " هـیچ کـەیف و خۆشـییەکی نـەماوە و وێـڕای ئـەوەیش بۆنـە بۆگەنەکـەی تەنانـەت دۆزەخـیش دەبـەزێنێ. دە گـوێبگرە بزانـە چـی دەڵـێم. مـن پـێم دەکـرێ لـە جیـاتی تـۆ بیکـوژم و ئەوسـا ئـیتر ئەنجامدەری ئەو کارە تۆ نابێت تا هەست بە ئازاری ویژدان بکەیت."

کانـدی لاقـەکانی لـە چـەرپایەکەیەوە شـۆڕکردەوەو بـە شـپرزەییەوە ڕدێنـی زبـری سـەر لاڕوومـەتی خـۆی خورانـد و بەناسـکییەوە وتـی: " تـۆ نـازانی مـن چەند هۆگری بوومە... چونکە هەر بە توولەیی خۆم بەخێوم کردووە."

کارڵـسۆنیش وتـی: " باپێـت بڵـێم، تـۆ بـە زینـدوو هێـشتنەوەی هـیچ میهرەبانییـەکی بەرامبـەر ناکـەیت. گـوێم لێبگـرە، ئێـستا سـەگەکەی سـلیم بەچـکەی بـووە، دڵنیـام کـە سـلیم دانەیـەك لـەو توولەلانـەت دەداتـێ بـۆ ئـەوەی گەورەی بکەیت، نایدەیتێ سلیم؟"

تـا ئـەو کاتـە قەتارچـییەکە بەچـاوە مەنگـەکانی لـەپیرە سـەگەکە وردەبـووەوەو وتـی: " بـا. ئەگـەر دەتـەوێ توتەڵەیـەك بـۆ خـۆت بـەرە." پاشـان خـۆی ڕاوەشـاندو وەکـو بڵێیـت بـۆ قـسەکردن ئامـادە بێـت وتـی: " کارڵـسۆن لەسـەر هەقـە کانـدی. ئـەو سـەگە هـەتا بـە کـەلکی خۆیـشی نایـەت. ئومێـدەواری ئـەوەم کـاتێ کـە مـن ئـاوا پـیرو کفـت و دەسـتە پاچـە دەبم یـەکێك گوللەیـەکم پێـوە بنێ و بمکوژێ."

لەبەرئــەوەیش کــە ڕاوبۆچــوونەکانی ســلیم وەکــو ســەنگی مەحــەك وابــوون، بۆیــە کانــدی بــە کەساســییەکەوە تێــی ڕوانــی و وتــی: " ڕەنگــە ئــەوە عــەزابی بدات، ئیّ خۆ من حەز دەکەم بە تەنگییەوە بێم."

کارلْــسۆنیش وتــی: " مــن بــە شــێوەیەکی وا دەیکــوژم کــە هەســت بــەهیچ شــتێك نــەکات. گوللەکــە ڕێــك تــا نــەوێ دەدەم." ئەمــەی وت و بــە کەلەموســتی پێــی جێگــای مەبەســتی پیــشان داو بــەردەوام بــووەوە: " ڕێــك لــە پــشتی ســەری دەدەم، بەشێوەیەکی کە تەنانەت مووچڕکەیەکیشی پێدا نەیەت."

کانــدی یــەك بــە یــەکی دەموچــاوەکانی بەســەر کــردەوە، وەك ئــەوەی بــۆ دەستگیرۆیی بگــەڕێت. ئێــستاکە نــیتر دەرەوە شــەوە زەنگێــك بــوو بــۆ خــۆی. لــەو دەمــەدا کۆلکێــشێکی تــولاز هاتــە ژوورەوە. شــەپیلکە داکــەوتووەکانی بــەرەو پێــشیّ کــوورِ ببونــەوەو زۆر بــە قورســیی دەڕۆیــشت و پاژنــەکانی لــە عەردەکــە دەدا، وەك بلێــی گونیــە دانەوێلەیــەکی نادیــاری هــەلگرتبیّ. بــۆ لای چــەرپایەکەی ڕۆیــشت و شــەپقەکەی لەســەر ڕەفەکەیــدا دانــا. پاشــان گــۆوارێکی لەســەر ڕەفەکــەی خۆیــدا هــەلگرت و هێنایــە بەرچــرای ســەر مێزەکــەو پرســی: " مــن تــا ئەمــەم پــیّ نیشان دایت سلیم؟"

"چیت پیّ نیشان دام؟"

تولازەکــە قــەدەرێك بــە لاپــەڕەکانی دواوەی گۆوارەکــەوە خــۆی خــەریك کــردو ئینجا لەســەر مێزەکــەدا داینــاو بــە ئەنگوســت ئیــشارەتی کــردو وتــی: " تــا ئــەوە، بیخوێنەرەوە."

ســلیمیش بەســەریدا نووشــتایەوە بیخوێنێتــەوە. گەنجەکــەیش وتــی: " دەی بە دەنگی بەرز بیخوێنەرەوە."

ســلیم بــە کــاوەخۆ کەوتــە خوێندنــەوە." ســەرنووســەری ئــازیز، ئــەوا بــۆ شــەش ســالّ دەچێــت مــن گۆڤارەکــەی ئێــوە دەخوێنمــەوەو لــەو بــاوەڕەدام کــە ئــەمڕۆ لــە بــازاڕدا باشــترین گۆڤــارە. زۆر چــیرۆکەکانی " پیتــەر ڕانــد" م بــە دلــە. هەســت

دەکەم پیاوێکی دانسقەو نایابە. حەزدەکەین چیرۆکی تری وەکو چیرۆکی ئەسپ سوارە ڕەشەکەمان بۆ بلاوبکەنەوە. من نامەی زۆر نانووسم. هەر تەنها لەوە تێفکریم پێتان بلێیم کە من لەو باوەڕەدام گۆوارە کەتان باشترین گۆوارە کە شایستەی ئەو " دایم"(١) ە بێت کەمن خەرجی دەکەم."

سلیم سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی سۆراخکەرانەی کردو وتی: " بۆچی ویستت ئەوە بخوێنمەوە؟"

ویتیش وتی: " دەی بەردەوام بە. ئەو ناوە بخوێنەرەوە کە لە سووچەکەی خوارەوەدا نووسراوە."

سلیمیش خوێندییەوە: " هەر سەرکەوتووبن، ولیەم تێنەر" دووبارە نیگای ویتیی کردەوەو وتی: " دە بلێ بۆچی ویستت ئەوە بخوێنمەوە؟"

ویتیش بە شێوەیەکی ناوازانە گۆوارەکەی پێوەدا و وتی: " بیل تێنەر" ت نایەتەوە بیر؟ کە بەرلەسێ مانگ لێرە کاری دەکرد؟"

سلیمیش کەوتە تێهزرین... و پرسی: " ئا، ئەو پیاوە بچووکەی کە گاسنەکەی دەئاژوا؟"

ویتیش قیژاندی: " بەڵێ ئەوە، خۆیەتی، ئا ئەو پیاوەیە."

"تۆ پێت وایە ئەو، ئەو پیاوەیە کە ئەم نامەیەی نووسیووە؟"

"بەڵێ. من ئاگادارم. چونکە ڕۆژێك من و بیل لێرە دانیشتبووین. بیل یەکێکی لەو گۆوارانە پێبوو کە تازە دەرچبوو. تەماشای دەکردو پێی وتم: " نامەیەکم بۆیان نووسیبوو. نازانم ئاخۆ تیایدا بلاویان کردۆتەوە !" بەلام تیایدا نەبوو. ئەنجا بیل پێی وتم لەوانەیە بۆ ژمارەی داهاتوو هەڵیانگرتبێ. ئا ئەوەتا ڕێك ئەو کارەیان کردووە. ئا ئەوەتا بلاویان کردۆتەوە."

سلیم وتی: " پێم وابێ لەسەر هەقیت، ڕێك تیایدا بلاوکراوەتەوە."

جۆرج دەستی بۆ گۆوارەکە درێژ کردو وتی: " دەهێڵی تەماشایەکی بکەم؟"

---

(١) : دەسێنتی یەك دۆلار.

ویتـــیش دیـــسان جێگـــای نامەکـــەی لـــە گۆڤارەکـــەدا دۆزییـــەوە، وەلێ گۆوارەکـــەی نەدایـــە دەســـتەوەو لـــەلای خـــۆی پاراســـتی. ئـــەنجا بـــە قـــامکی دۆشـــاومژەی نامەکـــەی پیـــشان داو پاشـــان بـــەرەو لای ڕەفـــە لـــە ســـنووق دروســـت کراوەکـــەی رۆیـــشت و بـــە هێمنیـــی و لەســـەرخۆییەوە گۆڤارەکـــەی لەســـەر دانـــاو وتـــی: " تـــۆ بلێـــی بیـــلێ گۆڤارەکـــەی بینیبـــێ؟ مـــن و بیـــلێ لـــەو پارچـــە کێلگەیـــەی بەرەگۆزەڵەکـــەدا کارمـــان دەکـــرد. هـــەردووکمان گاســنیـــشمان دەگێـــڕا. بەڕاســـتی بیلێ پیاوێکی ناوازەو جوامێر بوو."

لـــە تـــەواوی ســـەرویەندی ئـــەو دەمەتەقێیـــەدا کارڵـــسۆن بەرهەڵـــستی ئـــەوەی کـــرد کـــە راپـــێچ بکرێتـــە ناوییـــەوەو هـــەر ســـەرومڕ بـــوو لـــەوەی کـــە چـــاو لـــە، پـــیرە ســـەگە نـــەترووکێنێ. کانـــدیش زۆر بـــە ناڕەحەتییـــەوە چـــاودێریی دەکـــرد. ســـەرەنجام کارڵـــسۆن وتـــی: " ئەگـــەر دەتـــەوێ ئـــەوا هـــەر ئێـــستا کۆتـــایی بـــە مەینـــەتی و عـــەزابی ئـــەم شـــەیتانە پـــیرە دەهێـــنم و ڕزگـــاری دەکـــەم. ژیـــانی هـــیچ مانایـــەکی نییـــە. نـــاتوانێ خـــواردن بجاوێـــت، نـــاتوانێ شـــت ببینـــێ، هـــەتا بـــەبێ عەزیـــەت و ناخۆشی ناتوانێ ڕێیش بکات."

کاندی ئومێدوارانە وتی: " بەلاَم چەکت نییە."

"نیمـــە یـــانی چـــی. دەمانـــچەیەکی "لوگـــەر" م هەیـــەو بـــە هـــیچ شـــێوەیەکیش عەزیەت ناکێشێ."

کاندی وتی: " بەیانی بیری لێدەکەینەوە. با هەتا بەیانی چاوەڕێ بین."

کارڵـــسۆنیش وتـــی: " هـــیچ هۆیـــەك لـــە دواخـــستنی ئـــەوەدا نـــابینم." ئـــەوەی وت و بـــەرەو لای چـــەرپایەکەی خـــۆی رۆیـــشت و لەژێریـــدا چـــەمەدانەکەی دەرکێـــشا و دەمانـــچەیەکی "لوگـــەر" ی لەناوییـــەوە دەرهێنـــاو وتـــی: " دەبـــێ ئـــەم کـــارە ببڕێنینـــەوە و نـــەجاتمان بێـــت. پێمـــان نـــاکرێ لەگـــەڵ ئـــەودا بحـــەوین کـــە ئـــەم زێـــوارەی سەر لەبەر بۆگەن کردووە."

وای وت و دەمانچەکەی ناو دیووی گیرفانەکەی دواوەی کرد.

کانـدی بـە وردی بۆماوەیـەکی درێژخایـەن لـە سـلیم ڕامـا بـە ئومێـدی ئـەوەی نـارەزایی دەربڕێـت و ڕای خـۆی بگۆڕێـت. بـەلاَم سـلیم هـیچ پەرچـە کردارێکـی نـەبوو. بۆیـە سـەرەنجام کانـدی بەشـێوەیەکی نـەرمونیان و بێئومێدانـە وتـی: " دەباشـە.. بیبـە ئـیتر." ئەمـەی وت و بـەهیچ کلۆجێـك نیگـای سـەگەکەی نـەکرد. لەسـەر چەرپایەکەیدا پالَیدایەوەو باسکەکانی خستە ژێر سەری و چاوی لە میچەکە بڕی.

کارلَسۆن لـە گیرفانییـەوە قایـشێکی بـچکۆلانەی چـەرمینی دەرهێنـاو ئینجـا دانەوییـەوە و بـە گـەردنی سـەگە پیرەکـەدا شـەتەکی دا. لـەو ئانوسـاتەدا هـەر هـەموو پیاوەکـان تەماشـای ئـەو دیمەنـەیان دەکـرد هـەر تـەنها کانـدی نـەبێت. ئەوسـا دەنگـی لـە سـەگەکە کـردو بـە میهرەبانییەکـەوە وتـی: " دەی وەرە.. دەی وەرە بـابڕۆین." و پاشـان بـە دەنگێکـی ئێبـووردن ئامێزانـە بـە کانـدی وت: " هـەتا هەسـتیشی پـێ ناکـات." کانـدیش نـە لـە جێـی خۆیـدا بـزواو نـەیش پـاکۆی دایـەوە. ئـیتر کارلَـسۆن قایـشەکەی ڕاکیـشاو وتـی: " دەی بـابڕۆین." سـەگە پیرەکـەیش بـە هێواشـی و دژوارییەکـەوە هەسـتایە سـەر پێیـەکانی و کەوتـە دوای ئەو قەمتەرەوە کە زۆر میهرەبانانە ڕادەکێشرا.

سلیم وتی: " کارلَسۆن."

"ها سلیم چیت دەوێ؟"

"خۆ دەزانیت چی دەکەیت."

"مەبەستت چییە سلیم؟"

سلیمیش دەستبەجێ وتی: " لەگەلَ خۆتدا بێلَچەیەك بەرە."

"بـەلَێ. باشـە! لێـت حـالَی دەبم. ڕاسـت دەکـەیت." ئەمـەی وت و سـەگەکەی بـۆ نێـو تاریکاییەکـە بـردو ڕۆیـشت. جـۆرج هـەتا بـەر دەرگاکـە دوای کـەوت و پاشـان کلۆمەکـەی زۆر بـە ئەسـپایی خـستەوە جێگاکـەی خـۆی و دەرگاکـەی داخـست. کانـدیش بـەبێ تـەکان خـواردن لەسـەر وەتاغەکـەی خۆیـدا پالَکـەوتبوو چاوی بڕیبووە سایتەکە."

سلیم بە دەنگێکی بەرزەوە وتی: " سێ یەکێك لە قاترە باشەکانم عەزیەتی پێ گەیشتووەو دەبێ بچم تۆزێك قەترانی لێبدەم." ئینجا دەنگەکەی بەرە بەرە ڕەوییەوە. هەموو شتێك لە دەرەوەدا کش و مات هەڵگەڕابوو. هەنگاوەکانی کارتۆنیش چیدی نەدەبیستران. بێدەنگیی باڵی بەسەر ژوورەکەشدا کێشاو بەردەوامیی دەستەبەر کرد.

جۆرج قریووەیەکی لێوەهات و وتی: " بە شەرەفم ئێستا لێنی لەگەڵ توتکە سەگەکەی خۆی نە تەویلەکەدایە. ئیتر بڕوای بڕ نایەوێ بیّتە ئێرە، چونکە ئێستاکە ئیتر بووەتە خاوەن توتەڵە سەگێك."

سلیم وتی: " کاندی کام دانەت لەو توتەلانە دەوێ بۆخۆت بیبە."

کاندی بەرسقی نەدایەوە. خامۆشیی جارێکی تر بەسەر ژوورەکەدا بالادەست بووەوە. ئەو خامۆشییە لە تاریکیی شەوەوە دەهاتە دەرێ و ژوورەکەی بەرزەفت دەکرد.

جۆرج وتی: " کێ حەزدەکات نەختێك یاری "یوکەر" (١)م لەگەڵدا بکات؟"

ویتیش وتی: " من چەند دەستێك یاریت لەگەڵدا دەکەم."

هەردووکیان لەبەر رووناکی سەرمێزەکە نیزیاری یەك دانیشتن. بەلام جۆرج کاغەزەکانی تێکەڵ نەکرد، بەڵکو بە شێوەیەکی شپرزانە خڕڕەی لە لێواری دەستە کاغەزەکەوە هێناو دەنگی کزی ئەو تەقە تەقەیش کە دەری دەکرد سەرنجی هەموو پیاوەکانی نێو ژوورەکەی بۆخۆی ڕاکێشا و ئەویش چیدی ئەوەی ئەنجام نەداو دووبارە بێدەنگیی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشایەوە. بەم وێنەیە چەند خولەکێك ڕابوورد. کاندیش هەروەك خۆی لەسەر وەتاغەکەی ڕاکشابوو سەیری بنمیچەکەی دەکرد. سلیم بۆ ساتەوەختێك تەماشای کردو ئەوسا چاوی بڕییە دەستەکانی، دەستێکی خستبووە سەر دەستەکەی تری و ئاوا هێشتبوونییەوە. لەو کاتەدا دەنگی قرتە قرتێکی کز لە ژێر عەرزەکەوە

---

(١): یوکەر: جۆرە یارییەکی کاغەزە.

کەوتــە بــەرگوێ و ســەرجەمی پیاوەکــان خۆشــحاڵانە بــە ناراســتەی دەنگەکــەوە تەماشــای عەرزەکــەیان کــرد. هەرتــەنها کانــدی نــەبێ کــە هێــشتا هــەر بــەردەوام بوو لەوەی لە ساپیتەکە رامێنێ.

جــۆرج وتــی: " بــەوە دەچــێ جرجێــك ئــەو ژێــرەدا بێــت، پێویــستە تەڵەیــەك ئالەو ژێرەدا دابنێین."

ویــت چــیدی بەرگــەی نــەگرت و تەقییــەوە: " بۆچــی هێنــدە قنەقنــەی لێدەکــەیت؟ دە کاغــەزەکان دابــەش بکــە، بۆچــی دابەشیان ناکــەیت؟ بــەم شــێوەیە بێت ئێمە ناتوانین یاری "یوکەر" بکەین."

جــۆرج کاغــەزەکانی بــەرێکوپێکی پێکــەوە نــاو قــەدەرێك دیقــەتی پــشتەکانیانی دا. کش و ماتیی هەمدیسانەوە باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشابوو.

لــە دوورەوە تەقــەی دەمانــچەیەك دەنگیدایــەوە. پیاوەکــان هــەموویان بــەخێرایی ســەیری پیرەمێردەکــەیان کــرد. هــەر هــەموو دەموچــاوەکان بــەلای ئــەودا ئاوڕیــان دایــەوە. بــۆ دەمێــك لــە تەماشــاکردنی ســەقفەکە بــەردەوام بــوو. پاشــان هێــدی هێــدی وەرگەڕاو ڕووی کردە دیوارەکە و بێدەنگییەکی قووڵ بەسەریدا زاڵبوو.

جــۆرج بەســەرو ســەدایەکی بــەرزەوە کاغــەزەکانی تێکــەڵ کــردو کەوتــە دابــەش کردنیــان. ویــت تەختــەی تۆمــارکردنی خاڵــەکانی بــەرەو لای خــۆی ڕاکێــشاو پلــەکانی بــۆ دەســتپێکردنی یارییەکــە دیــاری کــردو وتــی: " وا دادەنــێم کــە ئێــوە هەر بەڕاستی بۆ ئیش هاتوونەتە ئێرە."

جۆرجیش وتی: " مەبەستت چییە؟"

ویتــیش پێکــەنی و وتــی: " چــونکە لــە ڕۆژی هەینیــدا هــاتن. هــەتا یەکــشەممە دوو ڕۆژی ئیشکردنتان هەیە."

جۆرج وتی: " من نازانم تۆ چۆنت لێك دەدەیتەوە."

ویــت دیــسان پێکەنییــەوەو وتــی: " تــۆیش ئــاوا لێکــت دەدایــەوە ئەگــەر ماوەیــەکی دوور و درێــژ لــەم مــەزرا گەورانــەدا بوویتایــە. ئــەو پیــاوەی کــە بیــەوێ چــاودێری

مەزرایەك بكات ئەوا پاش نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە دێت. شێوی ئێوارەی شەممە و سێ ژەمە خواردنی یەكشەممەیش دەخوات و ئەوسا پاش قاوەڵتی كردنی بەیانی ڕۆژی دوو شەممە بە بێئەوەی دەست بە هیچەوە بدات دەتوانێ واز لە ئیش بهێنێ و بڕوات. بەڵام ئێوە دوا نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی بۆ ئیش هاتن. بۆیە دەبێ ڕۆژو نیوێك هەروا كاربكەن.. ئیتر گرنگ نییە چۆن لێكی دەدەنەوە."

جۆرج بە هێمنیی چاوی تێبڕی و پێی وت: " ماوەیەك لێرەدا دەمێنینەوە، چونكە من و لێنی بەتەماین هەندێك پارە پێكەوە بنێین."

ئەو نانە دەرگاكە بە كاوەخۆ كرایەوە و مەیتەرەكە بەسەرێكی ڕەشی گێژو چارەیەكی بەخەم و كەسەرچرچولۆچ و دووچاوی ماندوو نەناسەوە هاتە ژوورەوەو وتی: " جەنابی سلیم."

سلیمیش چاوەكانی لەسەر كاندییەوە گواستەوە و وتی: " ها ؟ ئۆوو! سلاو كرووكس. ها چی بووە؟"

"تۆ پێت وتم ئەختێك قەتران بۆ پێی ئەو قاترە گەرم بكەمەوە. گەرمم كردەوەو ئامادەیە."

"ئۆو! بێگومان كرووكس. هەر ئێستا دێم و دەیخەمە سەری."

"ئەگەر رات لێبێ من دەتوانم بیكەم جەنابی سلیم."

ئینجا كەوتە سەرپێ و وتی: " نا. من خۆم دێم دەیكەم."

كرووكسیش وتی: " جەنابی سلیم."

"ها، چییە."

"ئەو پیاوە زەبەللاحە تازە هاتووە لەناو تەویلەكەدایەو خەریكی توتەڵەكانتە."

"قەیناكە، هیچ زیانێكیان پێ نابەخشێت. من خۆم یەكێكم لەو توتەلانە داپێی."

كرووكسیش وتی: " هەر حەزم كرد پێت بڵێم كە لە لانەكەوە دەریان دەكاتە دەرەوە و دەستكاریان دەكات. ئەوەیش هیچ بۆیان باش نییە."

سـليميش وتـی: " مەترسـە عەزيـەتيان پێناگەيـەنێت. دەی ئێـستا بـابڕۆين، منيش لەگەڵتدا دێمە دەرەوە."

جۆرج سـەری هـەڵبڕی و وتـی: " سلیمە ئەگـەر ئـەو قەحپەبابـە شرۆشـێتە خـۆی زۆر بـە شـتی پرو‌پـووچ و منداڵانـەوە خـەریك کـردووە، ئـەوا دەسـتبەجێ فرێـی بدەرە دەرەوە."

سليم دوای مەيتەرەکە کەوت و چووە دەرەوە.

جۆرج کاغـەزەکانی دابـەش کـردو ويـت هينـەکانی خـۆی قۆزتـەوەو بـە وردی چاوی پيادا خشاندن و وتی: " شۆخە تازەکەت بينی؟"

جۆرجيش وتی: " کام شۆخە؟"

"کوڕە ژنە تازەکەی کێرلی."

"بەڵێ، بينيم."

"دەبڵێ دەی، ژنێکی سووك نييە؟ "

جۆرجيش وتی: " زۆر دەمێك نابێ بينيومە."

ويـت بـە خـۆ پەسـنديیەکەوە کاغـەزەکانی دەسـتی لەسـەر مێزەکـەدا دانـاو وتـی: " دەی باشـە، ماوەيـەك لێـرە بمێنـەرەوەو بـە ئاگـاو چـاوکراوە بـە. ئەوسـا گـەلێك شـت دەبينـی، چـونکە ئـەو هـيچ شـتێك ناشـارێتەوە. هـەتا ئێـستا کەسـی وام نـەديووە. بـێ لێـرەيش چـاوی بـەدوای هـەموو کەسـێکەوەيە. مـن دڵنيـام کـە هـەتا لەمەيتەرەکـەيش چـاودادەگرێ و دەيـەوێ فريـووی بـدات. نـازانم چ مەبەستێکی هەيە؟"

جـۆرجيش بەکەمتەرخەمييـەکی سـەرپێييەوە پرسـی: " لەوەتـەی ئـەو هاتووەتە ئێرە هيچ گێروگازێك ڕوويداوە؟"

لـە ڕاستيـشدا بـە ئاشـکرايی دياربوو کـە ويـت هـيچ بايـەخێك بـە کاغـەزەکان نـادات. دەسـتە کاغەزەکـەی خـۆی لەسـەر مێزەکـەدا دانـاو جـۆرجيش خـستييە نێـو کاغـەزەکانی تـرەوە و دەسـتێ سـۆلیتێری هەڵبـژاردەی بڵاوکـردەوە.. حـەوت

کاغەزی ڕیز کرد، پاشان شەش دانەی خستە سەریان و ئینجا پێنج دانەی تری خستە سەریان.

ویت وتی: "دەزانم دەتەوێ چی بڵێیت. نەخێر. تا بەحاڵ هیچ شتێك ڕوونەداوە. تابەحاڵ لە دەرپێکەی کێرلیدا هەر تەنها کۆمەڵێ زەردەزیرە هەیە و بەس. هەموو ئەو کاتانەی کە پیاوەکانیش لێرە بن ئەو دەردەکەوێت. یا بۆ کێرلی دەگەڕێت یان هەست دەکات لەو دەوروبەرە شتێکی بزرکردووەو بەدوایدا دەگەڕێت. وەك بڵێی ناتوانێت لەو پیاوانەوە خۆی بە دووربگرێت. ناو دەرپێکەی کێرلیش پڕاو پڕە لە مێروولەو بەڵام هەتا ئێستا هیچ شتێکی لێوە بەرهەم نەهاتووە."

جۆرجیش وتی: "سەرنێشەو تەنگ و چەڵەمەیەکی زۆر دەنێتەوە. کارەساتێکی خراپیش بەسایەیەوە ڕوودەدات. دانەخۆرەی سەرتەڵەی زیندانەو ڕێك لەسەر پەلەپیتکەکەیدا دانراوە. ئەم کێرلییەیش قوری بۆ گیراوەتەوە. مەزرایەکی ئاوای پڕ لە پیاو جێگایەکی لەبارنییە بۆ ئافرەت، بەتایبەتی ئافرەتێکی وەکو ئەو."

ویتیش وتی: "ئەگەر حەز دەکەیت، سبەی شەو لەگەڵ ئێمەدا بۆ شار وەرە."

"بۆچی؟ چی بکەین لەوێ؟"

"هەروەکو هەموو جارێ دەچینەماڵی "سوزی" یە پیر. جێگایەکی زۆر خۆش و ناوازەیە. بەڕاستی "سوزی" یە پیر قۆشمەیە. هەمیشە سەرقاڵی نووکتەبازییە. هەروەکو ئەوەی کە شەوی شەممەی ڕابردوو کردی کاتێ کە سەرکەوتینە سەر بەرهەیوانەکەی پێشەوەی. "سوزی" دەرگاکەی کردەوەو پاشان کەوتە قیژەو هاواری لە کچەکان کردو وتی: "دەی کچان جلەکانتان لەبەربکەن سەرۆکی پۆلیس هاتووە." هەرگیزیش قسەی ناشرین و بێ شەرم و شکۆ ناکات... لەوێدا پێنج کچی لەژێر ڕکێفدایە."

جۆرجیش وتی: "ئەی چەنێ پارەی دەوێ؟"

"دوو دۆلارو نیو.. لەوێ پێکی وسکیت بەبیست و پێنج سێنت دەست دەکەوێت. لە ماڵەکەی "سوزی" دا ئەسکەمیلی زۆر جوان و ڕەحەتیش هەن بۆ دانیشتن. ئەگەر یەکێك نەیەوێت لەگەڵ کچەکاندا بخەوێت، ئەوا دەتوانێ هەر لەسەر ئەسکەمیلەکاندا دابنیشێت و دوو یاخود سێ پێکە وسکی بخواتەوەو وەخت بەسەر بەرێت.. "سوزی" یش هیچ بەتەنگەوە نایەت و گوێی لێ نییە. هیچ پەلەپەلیش لە پیاوەکان ناکات و هەیدێنیش لەوانە ناکات کە ئارەزووی هاوجێیی کچەکان ناکەن."

جۆرجیش وتی: " ڕەنگە بۆ بینینی خانووەکە بێم."

"زۆر بەجێیە وەرە لەگەڵمان، تا بلێی ڕادەبوێرین و خۆش دەیگوزەرێنین. هەمیشە هەر خەریکی نوکتەبازی و قسەی خۆشە. وەکو ئەوەی کە جارێکیان پێی وتین، وتی:

"خەڵکی وام ناسیوە کە ئەگەر مافوورێکی شڕو پەڕپوتیان لەسەر عەرزەکەیاندا ڕاخست و لەمپایەکی ڕازاوەی قشتیشیان لەسەر قەوانێکدا هەڵواسی ئەوا ئیتر وا دەزانن قەحپەخانە بەڕێوە دەبەن." ئەوە زەمی خانووەکەی کلارای دەکرد. ئینجا دوای ئەوە سوزی وتی: " کوڕگەل من دەزانم ئێوە چیتان دەوێ. کچەکانی من پاك و خاوێن و تەندروستن و وسکییەکەیشم ئاوی تیا نییە. ئەگەر هەر یەکێکیشتان حەز بە تەماشاکردنی لەمپایەکی ڕازاوەی قشتیلە بکات و نۆبەئی تووش بوون بە سووزەنەك بگرێتە ئەستۆ، ئەوا ڕێك دەزانن ئەو شوێنە لە کوێدایە، دەتوانن بۆی بچن. لێرە پیاوێکی زۆر هەن گەلاوگەڵ دەڕۆن، چونکە حەزیان لەوەیە تەماشای لەمپای ڕازاوەی قشتیلە بکەن."

جۆرج پرسی: " کەوابێ کلارا خانووەکەی تر بەڕێوە دەبات؟"

ویتیش وتی: " بەڵێ. بەلام قەت بۆ ئەوێ ناچین. چونکە کلارا بۆ خەوتن لەگەڵ کچەکان سێ دۆلار وەردەگرێت و پێکی وسکیش بەسی و پێنج سێنت

دەدات و هیچ نووکتەبازی و قسەی خۆشیش ناکات. بەلام خانووەکەی سوزی پاکو تەمیزە و کەلوپەل و ئەسکەمیلەکانیشی جوان و ناوازەن و بێجگە لەوەش ناهێلێ هەلەشەو شەرفرۆشان بچنە جێگاکەیەوە."

جۆرج وتی: " من و لێنی بەتەماین هەندێ پارە کۆبکەینەوە. لەوانیە لەگەلتان دا بێم و لەوێ پێکێ بخۆمەوە. وەلێ حەزناکەم بێم دوو دۆلار و نیو بە فیرۆ بدەم."

ویتیش وتی: " بەلام دەشێ مرۆ جاروبار ئارەزووی کەیفکردن بکات."

لەوعانەدا دەرگاکە کرایەوەو لێنی و کارلسۆن پێکرا هاتنە ژوورەوە. لێنی چووە سەر چەرپایەکەی خۆی و دانیشت و تەقەللای دا سەرنجی هیچ کەسێك بەلای خۆیدا رانەکێشێ. کارلسۆن دەستی درێژکردە ژێر چەرپایەکەی و چەمەدانەکەی هێنایە دەرەوە. تەماشای کاندییە پیری نەکرد کە هێشتا هەر رووی لە دیوارەکە بوو. کارلسۆن میلێکی بچکۆلانەی پاککردنەوە و قتوویەك رۆنی لەناو چەمەدانەکەیدا دەرهێنا. لەسەر وەتاغەکەیدا دانان و ئەوسا دەمانچەکەی دەرهێنا، شانەکەی هێنایە دەرەوەو بەچرکەیەك گوللەی سواری نێو لوولەکەی فرێدایە دەرەوە. پاشان بەمیلە بچکۆلانەکە دەستی بە پاککردنەوەی لوولەکە کرد. کاتێ کە قاوغی گوللە فرێدەرەکە قرتەوچرکەی لێوە هات، کاندی ئاوری دایەوەو بۆ چرکە ساتێك تەماشای دەمانچەکەی کردو ئەوسا دووبارە رووی بەلای دیواەکەدا وەرگێرایەوە.

کارلسۆن بەخەمساردییەکەوە وتی: " کێرلی هێشتا بۆ ئێرە نەهاتووە؟"

ویتیش وتی: " نەخێر. بۆ، چ مەراقێك کێرلی دلکرمێ دەکات؟"

کارلسۆن بەچاوێك سەیری نێو لوولەی دەمانچەکەی خۆی کردو وتی: " بەدوای ژنەکەی دا دەگەرێ. لە دەرەوە بینیم، هەر خەریکی ئەملاو ئەو لاکردن بوو."

ویتیش بەلاقرتێوە وتی: " نیوەی وەختەکەی خۆی لەوەدا بەسەر دەبات کە بە دوای ژنەکەیدا دەگەرێت، ئەو دوای وەختەکەیش ژنەکەی بەسەری دەبات و بەدوای ئەودا دەگەرێت."

کێرلی لە پڕێکا بە هەڵچوون و هەڵەشەییەکەوە خۆی بە ژووردا کردو وتی: " کوڕینە کەستان ژنەکەمتان بینیووە؟"
ویتیش وتی: " ژنەکەت نەهاتووەتە ئێرە."
کێرلی بە شێوەیەکی هەڕەشە ئامێزانە سەیری ئەم لاو ئەولای ژوورەکەی کردو وتی: "ئەی سلیم لەچ جەهەننەمێکدایە؟"
جۆرج وتی: "بۆ تەویلەکە چوو. چوو نەختێك قەتران لە سمێکی شەقبردو بدات."
سەرشانەکانی کێرلی خاو بوونەوە و پانوپۆڕ بەدیار کەوتن و وتی: "چەند دەبێ رۆیشتووە؟"
"پێنج یاخود دە دەقیقە دەبێ."
کێرلی بە قەڵەمبازێك چووە دەرەوەو بەدوای خۆیدا دەرگاکەی بە قایمی پێوەدا. ویت هەستایە سەرپێ و وتی: " پێم وایە وا چاکە ئەوە ببینم. کێرلی تێکچووە ئەگینا ئاوا هەڵپەی بۆ سلیم نەدەکرد. کێرلی بۆکسوەشێنێکی کارامەو زیرەکە.. زۆر کارامەو زیرەکە.. لە پێشبڕکێی دەستکێشی زێڕین دا گەیشتە کێبەرکێی کۆتایی.هەتا ئێستاش هەر هەموو ئەو پارچە رۆژنامانەی هەڵگرتووە کە باسیان لێوە کردووە." ئینجا نەختێك کەوتە تێفکرین و وتی: " بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا چاکتر وایە واز لە سلیم بهێنێ، چونکە هیچ کەسێك نازانێ سلیم چی لێ دەوەشێتەوە."
جۆرج وتی: " لەو باوەڕەدایە کە سلیم لەگەڵ ژنەکەیدایە، وانییە؟"
ویتیش وتی: " وا دیارە. بەلاَم لە حەقیقەتدا سلیم لەگەڵ ژنەکەیدا نییە. لانیکەم لەو باوەڕەدا نیم کە سلیم لەگەڵیدا بێت. بەلاَم سەرباری ئەوەیش ئەگەر بگرەو بەردە وجاڕو جەنجاڵێك بەرپا بوو ئەوا پێم خۆشە ببینم. دەی وەرە بابڕۆین."
جۆرج وتی: " من هەر لێرە دەمێنمەوە و حەز ناکەم بەهیچ شتێکەوە بگلێم. من و لێنی پێویستیمان بەوە هەیە نەختێك پارە دەستەبەر بکەین."

کارڵسۆن لە پاککردنەوەی دەمانچەکەی بووەوەو لەناو جانتاکەدا دایناو جانتاکەی تەکاندا و خستییە ژێر چەرپایەکەی و وتی: " پێم وابێ باشترە بچمە دەرێ و چاوێکی تری پیادا بخشێنمەوە." کاندییە پیر هەروەك خۆی ڕاکشابوو نەدەجوولایەوە، لێنیش لەسەر چەرپایەکەی خۆیەوە بەشێوەیەکی وردبینانەو ئاگایانە چاودێری جۆرجی دەکرد. دوای ئەوەی ویت و کارڵسۆن ڕۆیشتن و دەرگاکەیش بەدوایاندا داخرا، جۆرج ڕووی کردە لێنی و پێی وت: " بیر لە چی دەکەیتەوە؟"

"جۆرج خۆ من هیچم نەکردووە. سلیم وتی چاکتر وایە بۆماوەیەك نەوازشی ئەو توتەڵانە نەکەم. سلیم وتی باش نییە زۆر دەستیان پیابماڵی، بۆیە منیش یەکسەر هاتمەوە ئێرە. جۆرج خۆ من هیچ هەڵەیەکم نەکردووە."

جۆرجیش وتی: " دەبوایە من ئەوەت پێ بڵێم."

"بەشەرەفم هیچ عەزیەتم نەدان. من هەر تەنها هێنەکەی خۆمم گرتبووە باوەش و دەستم پیادا دەهێنا، هیچی تر."

جۆرجیش لێی پرسی: " ئەی لە تەویلەکەدا سلیمت بینی؟"

"بەڵێ بینیم و ئامۆژگاری ئەوەی کردم کە چیتر نەوازشی ئەو توتکە سەگە نەکەم."

"ئەی ئەو کچەت بینی؟"

"کێ ژنەکەی کێرلی نەڵێی؟"

"بەڵێ. پێم بڵێ هاتە ناو تەویلەکە؟"

"نەخێر. بەهەرحاڵ من نەمبینی."

"ئەی هیچ سلیمت نەبینی لەگەڵیدا قسە بکات؟"

"نەخێر نەمبینی. نەهاتە تەویلەکەوە."

جۆرج وتی: " دەباشەدەی. من وای مەزەندە دەکەم کە ئەو پیاوانە هیچ شەڕێك نابینن، چونکە بەوە ناچێ هەرگیز بەرپا بێت. لێنی گوێبگرە.. تۆ خۆت دووربگرە، هەقت بەسەر هیچەوە نەبێت."

لێنیش وتی: " من هیچ حەز لە شەڕوهەرا ناکەم." ئینجا لەسەر وەتاغەکەی خۆی هەستاو لەپاڵ مێزەکە لەبەرامبەر جۆرج دا دانیشت. جۆرجیش بەبێ ئەوەی هەست بکات و هەر لە خۆوە کاغەزەکانی تێکداو دەستە سۆلیتێرەکەی خۆی بلاوکردەوەو بڕیاری ئەوەی دا کە هێورییەکی هۆشمەندانەو بەدیقەت و ورد بەکاربهێنێ.

لێنی کاغەزێکی وێنەداری هەڵگرت و لێی وردبووەوە، ئینجا ئاوەژووی کردەوەو جارێکی تر لێی وردبووەوەو وتی: " هەردوولایەکان هەروەك یەك وان. جۆرج، بۆچی هەردوولایەکان هاوشێوەن؟"

جۆرجیش وتی: " نازانم. هەر بەو شێوەیە دروستیان دەکەن. ئەی کاتێ کە سلیمت لە تەویلەکەدا دیت خەریکی چی بوو؟"

"سلیم؟"

"بەڵێ. لە تەویلەکەدا بینیت و پێی وتی تەوەندە توند توتکەکان نەوازش مەکە."

"ئۆو.. ڕاست دەکەی.. قتوویەك قەتران و فلچەیەکی پێبوو، نازانم دەیویست چییان پێ بکات."

"تۆ دڵنیای کە ئەو کچە نەهاتە ئەوێ وەکو چۆن ئەمڕۆ هاتە ئێرە؟"

"نەخێر. نەهاتە ئەوێ."

جۆرج ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: " هەردەم قەحپەخانەیەك بە پیاو بدەیت چاکترە، دەتوانێ بچێتە ئەوێ و خۆی مەست بکات و نارەزووەکانی بەدی بهێنێت و هەرچییەکی لەلەشدا هەیە بەبێ سەرئێشە بەجارێ خاڵی بکاتەوە. دەیشزانێ کە بە چەنێك لەسەری دەکەوێت. بەلام ئەم دانەخۆرەیەی تەڵەی زیندان ڕێك لەسەر پەلەپیتکەی زیندانەکەدا دانراوەو هیچ دەربازبوونی لێ چاوەڕوان ناکرێ."

لێنیێ زۆر دڵپەسەندانە گوێی بۆ وشەکانی شل کردو تۆزێك لێوەکانی خۆی جوولاندەوە بۆ ئەوەی لە گوێبستن بەردەوام بێ. ئینجا جۆرج لەسەری ڕۆیشت و وتی:

" لێنی، ئاندی گوشمانت لەبیرە؟ کە ئەو سەر وەختە بۆ قوتابخانەی ناوەندی دەچوو؟"

لێنیش وتی: " ئەو کورەی کە دایکی "پان کێک"(١) ی گەرمی بۆ منداڵان دەکرد؟"

"بەڵێ. ئا ئەو کورە. هەموو ئەو شتانەی شتێکیان بۆ خواردن تێداپە چاك دێنەوە بیرت." پاشان جۆرج بە جوانی لە دەستەی سۆلێتێرەکەی بەردەمی ووردبووەوە. برلیییەکی خستە سەر ریزی پێشەوە، ئینجا دوو خاڵییەك و سێ خاڵییەك و چوار خاڵییەکی دیناری بەسەردا کەڵەکە کردو وتی: " دەزانی ئا ئەو ئاندییە بەهۆی قەحپەیەکەوە ئێستا لە زیندانی سانت کوێنتین دایە."

لێنی بە پەنجەکانی کێشای بەسەر مێزەکەدا و وتی: " جۆرج؟"

"چییە؟"

"جۆرج، چەنێك دەخایەنێ هەتاکو ئەو جێگا بچکۆلەیە دەستەبەر دەکەین و لەسایەی بەرووبورمەکەیدا خۆشگوزەران دەژین و کەروێشکیش بەخێو دەکەین؟"

جۆرج وتی: " نازانم. هێشتا دەبێ پێکەوە پارەیەکی چاك بەدەست بهێنین. من پارچە زەوییەکی بچکۆلانە شك پێدەبەم، بەهەرزان دەتوانین دەستگیری بکەین، بەلام خۆ هەروا مفت نایبەخشن."

کاندییە پیر بە هێواشی وەرسووڕایەوەو چاوەکانیشی تا بلێی زەق هەلگەڕا بوون. زۆر بە دیقەتەوە تەماشای جۆرجی دەکردو گوێ ڕایەڵی بوو.

لێنی وتی: " جۆرج لە بارەی ئەو جێگایەوە قسەم بۆ بکە."

"نێ، من دوێنێ شەو پێم وتی."

"جۆرج دە توخوا دیسان بۆمی بگێڕەوە."

جۆرجیش وتی: " دە گوێ بگرە باپێت بلێم، ئەو عەرزە بریتییە لە دە ئەیکەر، ئاسیاوێکی بچکۆلانەو کۆختەیەکی خشپیلەو کولانە مریشکێکی تێدایە. کۆختەکەیش ئاندینێکی هەیە و باخێکیشی تێدایە پڕێتی لە دار گێلاس و دار سێوو دار هەڵووژەو دار گوێز و هەروەها چەند دارتوویەکیشی

---

(١) :جۆرە کێك یاخود نانەساجییەکی شیرینە کە لەناو تاوەدا سوور دەکرێتەوە.

تێدایە. گەورێکی بەرازیشی تێدا هەیەو شوێنێکیش بۆچاندنی وێنجە و ئاوێکی زۆر و زەبەندیش بۆتێراو کردنی."

"جۆرج ئەی کەروێشك؟"

"هێشتا جێگای کەروێشکی تیانییە، بەلاّم زۆر بەئاسانی دەتوانم چەند کولانەیەکیان بۆ دروست بکەم و تۆیش دەتوانی وێنجەیان دەرخوارد بدەیت."

لێنیش وتی: " ڕاست دەکەیت. دەتوانم. زۆر ڕاست دەکەیت دەتوانم."

دەستەکانی جۆرجیش لە دەستکاری کردنی کاغەزەکان دابڕان و دەنگی گەرم و گوڕ تر هەنگەڕا: " چەند دانە بەرزێکیش ڕادەگرین. دەتوانم کارگەیەکی دووکەڵخانەی وەکو ئەوەی باپیریشم دروست بکەم. هەرکاتێکیش کە بەرازێك بکوژینەوە دەتوانین گۆشتی لاران و گۆشتی توێ توێی سوێرکراوی لەشی بە دووکەڵ ئامادەبکەین و سۆسج و شتی لەو بابەتەی لێ دروست بکەین. کاتێکیش کە ماسی "سامن": بە ڕووبارەکەدا کۆچ دەکەن دەتوانین سەددانەیان لێ بگرین و سوێریان بکەین یاخود بە دووگەڵ ئامادەیان بکەین و ناشتایان پێ بکەین. هیچ شتێك لە ماسی سامنی بە هەڵم و دووکەڵ ئامادەکرو خۆشترو بەلەزەت تر نییە. کاتی میوە پێگەیشتنیش دەتوانین مرەبای لێ دروست بکەین و لەقتووی نێین.. هەروەها دروست کردن و لەقتوونانی دۆشاوی تەماتەیش ئاسانە. هەموو یەکشەممەیەکیش یان مریشکێ یاخود کەروێشکێك سەردەبڕین و دەیخۆین. لەوانەیە مانگایەك یاخود گیسکێمان هەبێت کە سەرتوێژی شیرەکەیان هێندە چڕو ئەستوورە دەبێ بە چەقۆ بیبڕیت و بە کەوچك دەری بهێنێ."

لێنی بە دووچاوی ئەبلەقەوە تێیدەڕوانی و کاندییە پیریش هەر لە ڕامانەکەی خۆی بەردەوام بوو. ئینجا لێنی بە میهرەبانییەکەوە وتی: " ئەوسا ئیتر ئێمە لەسایەی بەروبوومەکەیدا وەکو خوا پێداوەکان دەژێین."

جۆرجیش وتی: " بێگومان. لە باخچەکەشماندا هەموو جۆرە سەوزەیەکمان دەبێت و ئەگەر حەزیشمان لە خواردنەوەی ئەختە وسکییەك کرد ئەوا چەند

دانــە هێلکەیــەك یــان هەرشــتێکی تــر یــاخود هەنــدێك شــیری بــۆ دەفرۆشــین.
هەرلەوێــدا دەژیــن، تایبــەت دەبــین بــەوێ و مێتــۆی پێخــوە دەگــرین. چــیدیش بــە دەوروبــەری دیــاردا راکــە راك ناکــەین یــان بــۆ نــمەوەی لــە خارنگــە هــەرزان و پەرپوتەکانــدا لەلایــەن چێــشتکەرە ژاپۆنییەکانــەوە خواردنمــان دەرخــوارد بــدرێت. نــەخێر جــەناب ئــیتر جێگــەو حــانووی تایبــەتی خۆمــان دەبێــت و هــەرگیز لــە خانووی کرێکاراندا ناخەوین."

ئینجــا لێنــی بــە پاڕانــەوەوە وتــی: " جــۆرج دەباشــە ئێــستا لــەبارەی خانووەکەوە قسە بکە."

"بێگومــان. خانوویــەکی بــچکۆلانەمان دەبێــت و ژووریــش بۆخۆمــان و ئــاگردانێکی ئاســــنی قەبــــەو بچکۆنەیــــشمان دەبێــــت و زســــتانان ئــــاگری تێــــدا دەکەینــــەوەو دایدەگیرســێنین. لەبەرئــەوەیش کــە زەوییەکــەمان پانوبــەرین نییــە بۆیــە پێویــست ناکــات زۆر خۆمــــان مانــــدوو بکــــەین و ســــەخت کاربکــــەین. لەوانەیــــە رۆژی شــــەش، حــــەوت ســـەعات کاربکـــەین. پێویـــستیش ناکـــات رۆژی یـــانزە ســـەعات فـــەردە جـــۆ بگوازینـــەوە. کـــاتێکیش کـــە دانەوێڵـــە دەچـــێنین خۆمـــان بـــۆ پێگەیانـــدن و چـــاودێری کردنـــی لـــەوێ دەبـــین و دەزانین کە کێڵگەکەمان چی بەرهەم دەهێنێت."

لێنــیش بــە شــەوق و زەوقێکــەوە وتــی: " کەروێــشکیش پــەروەردە دەکــەین. من ئاگــام لێیــان دەبێــت و بــەخێویان دەکــەم. توخــوا جــۆرج باســی ئــەوەش بکــە کــە چۆن بە تەنگیانەوە دێم."

"بێگومــان.. بــە توورەکەیەکــەوە دەچــیتە نــاو وێنجەزارەکــەو پــڕی دەکــەیت و دەی هێنیتەوەو دەیخەیتە کولانەی کەروێشکەکانەوە."

لێنــی وتــی: " کەروێــشکەکانیش دەیکــرۆژن و دەیکــرۆژن، هــەر ڕێــك بــەو شێوەیەی کە لێو دەژەنن، بینیومن."

جــۆرج درێــژەی دایــێ و وتــی: " هــەر شــەش حەفتــە جارێــك ئــەو دێڵــە کەروێشکانە بەچکەیان دەبێت و کەروێشکێکی زۆرمان دەبێت هەم بۆ خواردن

و هـــەم بــۆ فرۆشــتنیش. چــەند دانــە کــۆتریکیش ڕادەگــرین بــۆ ئــەوەی وەکــو سەردەمی منداڵیم بەدەوری ئاسپاوەکەدا هەڵفڕن."

ئینجـا تەماشـایەکی شـەیدایانەی دیوارەکەی سەر شـەری لینـی کـردو وتـی: "هـەر هــەموو ئەوەیش مـوڵکی خۆمــان دەبـێ و هـیچ کەسـێك نـاتوانیٚ تیـای دەرمـان بکـات. ئەگـەر لـە یـەکێکیش پەسـت بـووین ئـەوا پێیـدەڵێین: " بـڕۆ لێـرە مەمێنـە." و وەی لـە حـاڵی ئەگـەر نـەڕوات. ئەگـەر هاوڕێیـەکیش بـۆ میوانیمـان بێـت، بێگومــان چــەرپایەیەکی زیادەمــان دەبێـت، ئەوسـایش پێیـدەڵێین: " بۆچـی ئــەم شــەو لێــرە نامێنیتــەوە؟" و ئــەویش ڕازی دەبــێ و لەگــەڵمان دەمێنێتــەوە. هــەروەها ســەگێکی شــکاری و دوو دانــە پــشیلەی خەتخــەتمان دەبێــت، بــەڵام دەبــێ ئاگـات لـەو پـشیلانە بێـت بەچـکە کەروێـشکەکان نـەخۆن." لینـی کـە زۆر سـەخت و دژوارانـە هەناسـەی دەدا وتـی: " تـۆ لێبــان گــەڕێ باشـتێکی وابکـەن و بەچـکە کەروێــشکەکان بخــۆن ئینجــا بزانــە چــۆن ئەســکوردە نەفرەتییەکــەیان هــوورد دەکــەم. بزانــە مــن... بزانــە مــن چــۆن بــەتێلا هەلاهــەلایان دەکــەم.." ئەوســا نـەختێك دامرکایـەوەو بۆخـۆی کەوتـە پرتـەو بۆڵـە و هەڕەشـە کـردن لـە پـشیلەکانی ئاینده کە ڕەنگە بوێریی ئەوە بکەن باری کەروێشکەکانی ئایندەی بشێوێنن.

جۆرج فریفتەی خەون و خەیاڵەکانی خۆی دانیشتبوو.

کاتێــك کــە کانــدی کەوتــە قــسە کــردن هــەردووکیان لــە جێــی خۆیــان دا ڕاچـڵەکین وەك بڵێیـت لەسـەر ئەنجامـدانی شـتێکی شـەرماوەرو ناپەسـەند گیرابـن. کاندی وتی: ئێوە دەزانن شوێنێکی ئاوها لەکوێ هەیە؟"

جـۆرج دەمودەسـت هاتـەوە سـەرخۆی و وتـی: " وایـدابنێ دەزانم، جـا بـە تـۆ چـی؟ "

"پێویست ناکات پێم بڵێن لەچ شوێنێکدایە. دەشێ لەهەر جێگایەکدا بێت."

جۆرجیش وتی: " بەڵێ. زۆر ڕاستە. تۆ سەد ساڵیش بۆی بگەڕێیت نایدۆزیتەوە."

کانـدیش بـە هەڵـچوونێکی ئاشـکراوە وتـی: " داخـۆ بـۆ شـوێنێکی ئـە ئـاوا چەنێکیان دەوێ؟"

جۆرج بەبەدگومانییەکەوە لێی ڕامـاو وتـی: " ئـەها.. دەتـوانم بەشـەش سـەد دۆ وەگیری بهێنم. ئەو پیرەمێردو پیرێژنەی کە خاوەنی ئەو شوێنەن قرخن و مایە پوو بوونەو پیرێژنەکەیش پێویستی بەنەشتەرگەری هەیە. بەلام پێم بلێ.. بەتۆچی؟ خ تۆ هیچ پەیوەندییەکت بە ئێمەوە نییە ئیتر بۆ دەتەوێ بزانی؟"

کاندیش وتی: " مـن بەیـەك دەسـتەوە زۆر بـە کـەلکی ئـیش کـردن نایـەم. مـ لـەم مەزرایـەدا دەسـتی خـۆمـم لـە کـیس چـوو. لەبەرئـەوە لێـرە کـاری ناسـان خزمـەت و بەردەسـت کردنیـان پێـداوم. هـەروەها بـەهۆی لەدەسـت دانـم دەستیـشمەوە دووسـەدو پـەنجا دۆلار یـان دامـێ و خۆیـشم هـەتا ئێـستا پـەنج دۆلاری تـرم پاشـەکەوت کـردووەو لـە بانکـدا دامنـاون. ئـەوە هـەمووی سـێ سـە دۆلاری کـردو لـە کۆتـایی ئـەم مانگەشـدا پـەنجا دۆلاری تـر وەردەگـرم. جـ گـوێبگرە بزانـە چـی دەڵـێم." تۆزێـك بەتاسـەو پەرۆشـەوە بـەرەو پێـشەو لاربـووەوەو وتـی: "وا بـزانم منیـش لەگەڵتانـدا بەشـداردەبم. مـن سـێ سـەد و پـەنجا دۆلار دەخەمـە ئـەو ئـەم پرۆژەیـەوە. با ئـەوەش بلێـم کـە مـن زۆر بـە کـەلکی ئـیش نایـەم، بـەلام دەتـوانم چێشت لێ بنێم و مریشك بـەخێو بکـەم و هەندێکیش باخچە پاك بکەمەوەو بژاری بکەم. ها ئەوەتان پێ چۆنە؟"

جۆرجیش بـەنیوەیی چـاوەکانی خـۆی نوقانـدو وتـی: " دەبـێ ئـەختێك بـیری لێ بکەمـەوە. چـونکە ئێمـە هەمیـشە بەتـەمای ئـەوە بـووین کـە هـەردووکمان ئـەو کارە بکەین."

کانـدی قـسەکەی پێـبری و وتـی: " وەسـیەتنامەیەکیش دەنووسـم و بەشـەکەی خۆم بـۆ ئێـوە بـەجێ دەهێـلم، هـەت ئەگـەر هـاتوو مـردم ئێـوە میراتگری مـن بـن، چونکە مـن هـیچ خزم و کـەس و کـارێکم نییـە... ئـەی ئێـوە هـیچ پارەتـان پێیـە؟ ڕەنگە دەستبەجێ بتوانین ئەم پرۆژەیە ئەنجام بدەین."

جـۆرج بـە قێزەوونییەکـەوە تفـی هەڵدایـە سـەر عەرزەکـەو وتـی: " بەهەردووکمانەوە دە دۆلارمان هەیە." پاشـان وەکـو ئـەوەی لەبیرکردنـەوەدا بـێ

وتـی: " تـۆ گـوێ بگـرە، ئەگـەر مـن و لێنـی مانگێـك كاربكـەین و هـیچ خـەرج نەكـەین ئـەوا سـەد دۆلارمـان دەبێـت و بەهەموویـەوە دەبێتـە چـوار سـەد دۆلار. دڵنیـام كـە دەتـوانین بـەو پارەیـە پرۆژەكـەمان هەڵسـوورێنین. ئەوسـا تـۆو لێنـی دەتـوانن بـڕۆن و تیایـدا دەسـتبەكاربن و منـیش ئیـشێك پەیدادەكـەم و هەوڵـدەدەم ئـەو دوای پارەكـە بەخاوەنەكـەی بـدەم و ئێـوەیش ئـەو ماوەیـەدا دەتوانن هێلكەو شتی ئەو بابەتەش بفرۆشن."

ئینجـا هـەموویان كەوتنـە نێـو بێدەنگییـەكی قووڵـەوە و بەحەپەسـانەوە تەماشـای یـەكتریان كـرد. لـە ڕاسـتیدا ئـەو شـتەی كـە هـەرگیز باوەڕیـان نـەدەكرد بێتـەدی، خـەریكبوو دەهاتـە دی. جۆرج بـەخۆ نـازین و فیزیكـەوە وتـی: " بـەخوا! مـن لـەوە دڵنیـام كـە دەتـوانین بیكـڕین." و چاوەكانیـشی لـەنێو سەرگەشـتەییدا نقـووم ببـوون و دووبـارە بـە ناسـكییەكەوە ئـەوەی دووپـات كـردەوە: " دڵنیـام لەوەی كە دەتوانین بیكڕین."

كانـدی لەسـەر پاڵـدمی چـەرپایەكەی خۆیـدا دانیـشت و بەشـپرزەییەوە كۆتـەرەی مەچـەكی دەسـتە بڕاوەكـەی خورانـدو وتـی: " بـەر لـە چـوار سـاڵ ئـەم كارەسـاتەم بەسـەرهات. دەزانم زووبـەزوو دەیانـەوێ دەرم بكـەن. هـەر كـە ئـیتر خزمـەتم پێنـەكراو نـەمتوانی خـانووی كرێكـاران پاكبكەمـەوە دەرم دەكـەن و بـەرەلای نێـو شارۆچـكەكەی ئـەم ناوچـەیە دەكـەن.بـەلام ئەگـەر مـن پارەكـەی خـۆم بـە ئێـوە بـدەم، هەرچـی چۆنێك بێـت ئێـوە دەهـێڵن مـن باخـچە بژاربكـەم گەرچـی لـەو ئیـشەیش زۆر بـاش نـیم. جگـە لـەوە قـاپ و قاجـاغ دەشـۆم و ئـیش و كـاری ناچـیزو ئاسـانی تـری ئـەو بابەتـە دەكـەم. بـەلام ئـەو شـتانە لەسـەر خانووبـەرەی خۆمـان ئـەنجام دەدەم و ئـیش لەسـەر جـێ و شـوێنی خۆمانـدا دەكـەم." دوای ئـەوە بە كلۆڵییەكـەوە گـوتی: " خـۆ بینیتـان ئەمـشەو چییان لـە سـەگەكەم كـرد؟ وتیـان بـە كـەڵكی خـۆی نایـەت و بەكـەڵكی هـیچ كەسـێكیش نایـەت. ئاواتیـشم ئەوەیـە ئـەو دەمـەی كـە لێـرە دەرم دەكـەن یـەكێك گوللەیـەكی بـەزەییناميێزم پێـوە بنـێ و

بکیوژێ. بەڵام کەس شتێکی ئەو بابەتە ناکات و هیچ شوێنێکیشم نییە رووی لێ بنێم و نیتر نایشتوانم هیچ نیشێك پەیدا بکەم. هەتا ئەو کاتەی کە ئێوەش دەست لە کاردەکێشنەوە سێ دۆلاری دیکە پاشەکەوت دەکەم."

جۆرج هەستایە سەرپێ و وتی: " دەستگیری دەکەین، ئەو شوێنە بچکۆلانە دێرینە رێك دەخەین و دەچین لەوێدا دەژین." ئینجا دووبارە دانیشتبەوە. هەموویان بەبێ جوڵە دانیشتبوون و بەجوانی و بێهاوتایی ئەو شتە هێدم دایگرتبوون، هزری هەریەکەیشیان چووبوە ناو داهاتووەوە، ئەو کاتەی کە ئەم خەونە دانسقەیە دێتەدی.

جۆرج بەسەرلسیمەییەوە وتی: " ئەی ئەگەر کەرنەڤاڵێك یاخود سیرکێك یان یاری تۆپێن یاخود هەر شتێکی تر بێتە شارەوە." کاندییە پیر سەری پێزانینی بۆ ئەو بیرۆکەیە راوەشاند. جۆرجیش وتی: " هەر بێ سێ و دوو کردن خۆمیان ئامادە دەکەین و بۆ بینینی دەچین. مۆڵەتی ئەوەیش لەهیچ کەسێك وەرناگرین کە ئایا دەتوانین بچین یان نا. هەر بە خۆمان دەڵێین." بۆی دەچین." و ئینجا یەکسەر دەرۆین. مانگاکە دەدۆشین و نەختێك دان بۆ مریشکەکان رۆ دەکەین و ئینجا بۆ کەرنەڤاڵ و شتەکە دەچین."

لێنی قسەکەی پێی بڕی و وتی: " هەندێ گیایش بۆ کەرویشکەکان دادەنێین. من هەرگیز لەوەبرانەدنی نەوانم نەیاد ناچێت. ئەی کەی بەم کارە هەڵدەستین جۆرج؟"

"پاش مانگێك. رێك پاش یەك مانگ. دەزانی چی دەکەم؟ نامەیەك بۆ ئەو پیرەمێردو پیرێژنە دەنووسم کە خاوەنی ئەو جێگایەن و پێیان دەڵێم کە ئێمە لێیان دەکرین. کاندیش سەد دۆلار دەنێری بۆ ئەوەی بۆخۆمان بیپەستینەوەو زامنی بکەین." کاندیش وتی: " بێگومان دەینێرم. ئەی تۆ بڵێی لەوێ ئاگردانێکی باشیان هەبێ؟" "بەڵێ. ئاگردانێکی زۆر باشیان هەیە، بۆ سووتاندنی خەڵووزی بەردین و داریش بە کەڵك دێت." لێنی وتی: "

مـن لەگـەڵ خۆمـدا توتەڵـە سـەگەکەم بـۆ ئـەوێ دەبـەم. بـەخوا دڵنیـام کـە ئـەوێی بەدڵ دەبێت، بەخوا دڵنیام."

دەنگـە دەنگـەکانی دەرەوە تـا دەهـات نـزیکتر دەبوونـەوە. جـۆرج بـە خێرایـی وتـی: " ئەمـە لـەلای هـیچ کەسـێك مـەدرکێنن. هـەر تـەنها ئێمـە هەرسـێکمان و بەس. چـونکە بۆیـان هەیـە بـەدەرکردنمان بـدەن بـۆ ئـەوەی نـەتوانین دەرامـەت پەیـدا بکەین. هـەر بـەو شـێوەیە هەڵـسوکەوت بکـەن کـەوا هـەتا هەتایـە هـەر گونیـە جـۆ باردەکـیـەین و دەگوازینــەوە، ئەوســا رۆژێــك لــە پرێکــا دەســتمەزدەکەمان وەردەگرین و لێرە وەل دەبین و دەڕۆین."

لێنـی و کانـدی سـەریان لەقانـدو بەکەیفوشـادییەوە بزەیـان هـاتێ. پاشـان لێنـی ژێرەکییانە بەخۆی وت: " من بە کەس ناڵێم."

کاندیش وتی: " جۆرج."

"ها چییە؟"

"جـۆرج دەبوایـە مـن خـۆم ئـەو سـەگەمم بکوشـتایە. نەیـشدەبوایە بهـێڵم پیاوێکی غەوارە سەگەکەم بکوژێت."

دەرگاکــە کرایــەوە. ســلیم هاتــە ژوورەوە و بــەدوای ئەویــشدا کێــرلی و کارلـسۆن و ویـت هاتنـە ژوورەوە. دەسـتەکانی سـلیم بەقـەتران ڕەش هەڵگـەڕابوون و لە تووڕەییشدا پێشی خواردبووەوە. کێرلیش خۆی بە ئانیشکییەوە گرتبوو.

کێرلی وتی: " ئێ خۆ مـن هـیچ مەبەسـتێکی خـراپم نـەبوو سـلیم. هـەر حـەزم کـرد لێـت بپرسم." سـلیمیش وتـی: " ئـێ دە باشـە. بـەڵام تـۆ هـەموو کاتێـك پرسـیارم لێدەکـەیت. وام لێ هـاتووە بێـزار بوومـە. ئەگـەر تـۆ نـاتوانی بەتـەنگ ژنـە لەعنەتییەکـەی خۆتـەوە بێـی، ئیدی چاوەڕوانی چیم لێ دەکەیت، من چی بکەم؟ دە وازم لێ بێنە ئیتر."

کێـرلیش وتـی: " هــەر تـەنها دەمویـست ئـەوەت پـێ بڵـێم کـە مـن هـیچ مەبەسـتێکی خـراپم نـەبوو. هـەر بـە مێـشکما ئـەوە خـتـوورەی کـرد کـە ڕەنگـە ژەنەکەمت دیتبێ بۆیە پرسیم."

کارلسۆنیش وتی: " ئەی بۆچی پێی نالێیت لە ماڵەوە بمێنێتەوە، لەو جێگایە بمێنێتەوە کە شایانێتی. تۆ ڕێگای دەدەی لە دەوروبەری خانووی کرێکاران دا بێت و بچێت و بسوورێتەوە، با پێشت بڵێم ئەوەندە ناباب دووچار دەبێت و شتێك بە دەستەکانتەوە دەلکێت و هیچیشت لەبارەیەوە پێناکرێت."

کێرلی بەلای کارلسۆن دا بایدایەوەو وتی: " تۆ خۆت لەم نیشەوە هەڵمەقورتێنە هەر تەنها ئەگەر بتەوێ بێیتە دەرەوە.."

کارلسۆن پێکەنی و وتی: " ئاخر هەی جیزی هیچ و پووچ تۆ هەوڵتدا گێچەڵ بەسلیم بکەیت و بیترسێنی بەلام نەتتوانی بیترسێنی. ئەویش بەسەرخۆت دا فڕێیدایەوە. تەماشای خۆت کە وەکو ژێر سکی قۆرباقە زەرد هەڵگەڕاوی. بزانە من گوێ نادەمێ، ئەگەر باشترین بۆکسبازی ولاتیش بیت گوێی نادەمێ. دە تۆ ئەگەر پیاوی بۆم وەرە، جا بزانە چۆن شەقێن بەسەرە لەعنەتییەکەت دەکەم."

کاندیش زۆر بە تۆخڤنەوە خۆی لەو شالاوە هەڵقورتاند و بەقێزەوونییەکەوە وتی: " هەی دەستکێش پڕ لە ڤازەلین."

کێرلی چاوێکی لێ بز کردەوە. چاوەکانی بەپەلە سەریان کردو بەسەر لێنی دا نیشتنەوە، لێنی هێشتایش هەر بەیادی مەزراکەوە خۆشحالانە بزە خەنینی دەکرد.

کێرلی وەکو سەگێکی تێرییەر بۆلای لێنی ڕۆیشت و وتی: " ئەی تۆ بەچی پێدەکەنی؟" لێنیش بەبێ هەست و خوستانە تەماشای کردو وتی: " چی؟"

ئەوسا غەزەبەکەی کێرلی تەقییەوە و وتی: " وەرە ئێرە هەی زلحۆرتی سەگوسەگباب. دەی هەستە سەر پێیەکانت. هیچ زلێکی کوڕی قەحپە نییە بەمن قەشمەری بکات. ئێستا پێت نیشان دەدەم کێ ترسنۆکە."

لێنی بە دۆشدامانەوە نیگای جۆرجی کردو پاشان هەستایە سەر پێ و ویستی پاشەکشێ بکات. کێرلیش وەکو بۆکسبازێك خۆی بۆ هێرش بردن

تـەیار و ئامـادە کـرد. بەدەسـتی چـەپی مـستێکی بـۆ لێنـی هاویـشت و بەدەسـتی ڕاستیـشی مـستێکی گرتـە لـوتی و پژانـدی. لێنـی لـە ترسـا هـاوارێکی کـردو خـوێن لـە لوتیـەوە فیـچقەی کـردە خـوارەوە. هـاواری کـردەوە: " جـۆرج، جـۆرج پێـی بڵـێ بـا وازم لێ بهێنـێ." ئینجـا گەڕایـە دواوە هـەتا پـشتی بـە دیوارەکـەوە دا، کێـرلیش هـەر بـە کێـشانی مـستەکۆڵە بەدەموچـاویدا دوای کـەوت. دەسـتەکانی لێنـی هـەر لـە لاتەنیـشتەکانیدا مانـەوەو نەجوولانـەوە، زۆر لـەوە زیـاتر سـڵەمیبووەوە کـە بتـوانێ داکـۆکی لـە خـۆی بکـات. جـۆرج هەسـتابووە سـەرپێ و هـاواری دەکـرد. " لێیـدە لێنـی. لێیـدە مەهێڵـە لێـت بـدات." لێنـی بەلەپـە مەزنـەکانی خـۆی دەموچـاوی داپۆشـی و لەترسـا کەوتـە نـاڵین و نـووزە نووز. ئینجا هاواری لێ هەستا: " جۆرج پێی بڵێ با لێم نەدات."

پاشـان کێـرلی کەوتـە پـەلاماردانی سـکی و ئـەوەیش تەنگـە پـشووی کـردو خەفـە بـوو. سـلیم هەڵبەزیـەوە و شـیتاندنی: " ئـا ئـەو ناپـاکیی چـەپەڵە، مـن خـۆم تۆڵـەی لێ دەسـتێنمەوە." جـۆرج دەسـتی درێـژکردو سـلیمی گـرت و هـاواری لێکـرد: " تـۆزێ سـەبربگرە." ئینجـا بەدەسـتەکانی دەوری دەمـی خـۆی ئابلووقەداو قیژاندی: " لێنی لێیدە!"

لێنـیش دەسـتەکانی لـەلای ڕووخـساری دوورخـستەوەو بـە نیگاکـانی منـەی جـۆرجی کـرد، لـەم ئانوساتەشـدا کێـرلی مـستێکی لـە چـاوەکانی داو دەموچـاوە پانوپۆڕەکەی لێنی خوێن دایپۆشی. جۆرج دووبارە قیژاندییەوە: " من وتم لێیدە."

مـشتی کێـرلی لەوەشـاندنا بـوو کـە لێنـی قۆزتییـەوە. پـاش سـاتێك کێـرلی وەکـو ماسـییەکی بـە قولاپـەوە بـوو پەلـەقاژێی پێکـەوتبوو و مـشتە نوقاوەکەشـی لـەنێو دەسـتە بێپایانەکـەی لێنـی دا بـزر ببـوو. جـۆرج بـەرەو لایـان ڕایکـردو وتـی: " بەرەلایکە لێنی.. بەرەلای کە.."

بەڵام لێنی زارەترەك سـەیری ئـەو پیـاوە بـچکۆلە بـە پەلـەقاژێ کـەوتووەی کـرد کـە بـە دەسـتی بـەرزەفتی کردبـوو. خـوێن بـە ڕووخـساری لێنـی دا دەهاتـە خـوارەوەو یـەکێك لـە

چاوەکانی هەڵتەقابوو هاتبووەوە یەك و نوقبا بوو. جۆرج چەند تەوقاتێکی لەدەموچاوی سڕەواند، بەلام لێنی هێشتابش هەر مشیته داخراوەکەی نەکردەوە. ئێستاکە ئیدی کێرلی کرژبووەوە و وەك جاو سپی هەڵگەڕابوو، کێشمەکێشەکەشی بێ هێز ببوو. ڕاوەستابوو هەر هاوارو شیتەی دەکردو مشتیشی لەنێو لەپی لێنی دا ون ببوو.

جۆرج دووبارە و پەیتا پەیتا قیژاندییەوە: " دەستی بەرەلاکە لێنی... بەرەلای کە.. سلیم وەرە یارمەتیم بدە هەتا پیاوەکە هێشتا دەستی بە بەرەوە ماوە." ئینجا ناگەهان لێنی دەستی پیاوەکەی بەرهەڵدا کردو ڕۆیشت لە پاڵ دیوارەکەدا کرۆشکەی کردو مت بوو. ئەوسا بە دەنگێکی مەینەتبارانەوە وتی: " جۆرج تۆ پێت وتم وابکەم."

کێرلی لەسەر عەرزەکەدا دانیشتبوو بە جەپەسانەوە سەیری دەستە وردو خاشەکەی خۆی دەکرد. ئەنجا سلیم و کارلسۆن بەسەریدا نووشتانەوەو دواتر سلیم قیت بووەوە و بە تۆقینێکەوە لەلێنی ڕامان وتی: " دەبێ بۆلای پزیشك ببەین، پێم وابێ هەرچی ئێسکی دەستی هەیە شکاوە."

لێنیش هاواری کرد: " من نەمدەویست هیچی لێبکەم.. من نەمدەویست ئازاری بدەم." سلیمیش وتی: " کارلسۆن تۆ عەرەبانەکە ئامادە بکە. دەیبەینە سۆلێداد و لەوێ تیماری دەکەین." کارلسۆن بە پەلەپرووزێ چووە دەرەوە. سلیم ئاوڕی لە لێنی دایەوە کە دەستی کردبووە فینگە فینگ و پێی وت: "خەتای تۆ نەبوو، ئەم بوودەڵەمو هیچ و پووچە دەمێکە لە گێچەڵ دەگەڕێ. بەلام.. ئەی خوای گەورە ! خۆ ئەو کابرایە دەستی مەحف بووەوە." ئینجا سلیم بەپەلە چووەدەرەوە و پاش چرکە ساتێك بە کووپێکی تەنەکەی پڕ لە ئاوەوە گەڕایەوەو نای بە لێوەکانی کێرلییەوە.

جۆرج وتی: " سلیم پێم بلێ ئێستا ئێمە دەردەکرێین؟ بەڕاستی ئێمە پێویستیمان بە دەرامەت هەیە. تۆ بلێی ئێستا ئیتر باوکی کێرلی دەرمان بکات؟"

سلیم زەردەخەنەیەکی مەکرنازانەی کردو لە تەنیشت کێرلی دا لەسەر چۆك دانیشت و وتی: " ئێستا ئەقلت بە تەواوەتی هاتووەتەوە سەرخۆی هەتا گوێم لێبگری؟"

کێـرلیش سـەری ڕەزامەنـدی ڕاوەشـاند. سـلیمیش درێـژەی بـە قـسە داو وتـی: " دەی باشـە، کەواتـە گـوێبگرە، پـێم وابـێ باشـتر وایـە بلێیـبت دەسـتت لـەناو مەکینەیەکـدا گیربـوو. ئەگـەر تـۆ بـە کـەس نـەلێیت چـی ڕووی دا، ئـەوا ئێمـەیش دایدەپۆشـین و بەکـەس نـالێین. بـەلام تـۆ هەرکـە باسـی بکـەیت بـۆ ئـەوەی ئـەم پیـاوە بـەدەرکردن بـدەیت ئـەوا ئێمـە بـە هـەموو کەسێك دەلـێین و ئەوسـایش تـۆ دەبیتە مەسخەرەو گالتەجار."

کێـرلیش وتـی: " نـا مـن نایگێڕمـەوە." ئەمـەی وت و لـەوە خـودداری کـرد کە تەماشای لێنی بکات.

لـە دەرەوە دەنگـی چـەرخەکانی گالیـسکەیەك دەهاتـە بـەرگوێ. سـلیم هاریکـاری کێـرلی کـردو هەلیـساند و پێـی وت: " دە ئێـستا کـە بـڕۆ کێـرلی، کارلـسۆن بـۆلای پزیـشك دەتبـات." پاشـان هـەتا دەرەوە کۆمـەکی کێـرلی کـردو بـردی. دوای ئـەوەش دەنگـی چـەرخەکان هێـدی هێـدی دوورکەوتـەوە. ئینجـا دوای چرکە سـاتێك سـلیم بـۆ نـاو خـانووی کرێکارەکـان گەڕایـەوە. تەماشـایەکی لێنـی کرد، هێـشتا هـەر بـە زنـۆق چـوویی لـە پـاڵ دیوارەکـەدا گرمۆلـە ببـوو، سـلیم پێـی وت: " دەستەکانت بێنە با بیان بینم."

لێنیش دەستەکانی خۆی بۆ ڕاگرت.

سـلیم وتـی: " ئـەی خـودای گـەورە، دەتـۆقم ئەگـەر لـە خـۆم تـووڕەو شـێتگیرت بکـەم." جـۆرج قـسەکەی پـێ بـڕی و ئاوهـا بارەکـەی ڕاڤـە کـردەوە: " لێنـی ترسـی لێ نیـشتبوو، نەیـدەزانی چـی بکـات. ئـەی مـن پـێم نـەوتی نـابێ هـیچ کەسـێك شەڕی پێ بفرۆشێ. نا. بەتۆم نەوت، پێم وابێ بەکاندیم وت."

کانـدیش بـە ویقارێکـەوە سـەری لەقانـدو وتـی: " ڕاسـتە، ڕێـك وات وت. ڕێـك ئـەم بەیانییـە کـاتێ کـە کێـرلی دەستپێـشکەری کـردو سـەری نایـە سـەرهاوڕێکەت، تـۆ وتـت: " ئەگـەر چـاکەی خـۆی بزانێـت وا چـاکە دەخالـەتی لێنـی نـەکات." دەق ئـا ئەمـەت پـێ وتم." جـۆرج ئـاوڕی لـە لێنـی دایـەوەو وتـی: " ئـەوە گونـاهی تـۆ نـەبوو،

هـیچ پێویـستیش ناکـات سـڵ بکەیتـەوە. تـۆ هـەر تـەنها داواکارییەکـەی منـت جێبـەجێ کـردو باشـتریش وایـە بـچیتە گەرماوەکـە و دەموچـاوت بـشۆریت. سـەیرکە چـۆن دەموچـاوتی ڕیـسوا کـرد." لێنـی بـەو دەمـە خـوێن تێـزاو و شـین و مۆرەیـەوە بـزەی هـاتێ و وتـی: " مـن نەمدەویـست تووشـی کێـشە و بـەڵا بم." ئینجـا بـەرەو دەرگاکە ڕۆیشت، وەلێ بەرلەوەی بیگاتێ ئاوڕی دایەوەو وتی: " جۆرج؟"

"ها چیت دەوێ؟"

"جۆرج، هێشتایش هەر دەتوانم کەروێشکەکان پەروەردە بکەم؟"

"بێگومان. خۆ تۆ شتێکی ناهەموارت نەکرد."

"جۆرج خۆمن هیچ مەبەست و نییەتێکی خراپم نەبوو."

"دەباشە ئیتر، تۆ جارێ برۆ چروچارەت پاك و خاوێن بشۆ..."

چـەرپایەکەی کرووکـسی قوڵەڕەشـی مەیتـەر لـە ژووری ڕەخـت و ئەسـپاب و کەلوپـەلی ئەسـپەکاندا بـوو، کـە زنجێکـی بـچکۆلانە بـوو پـاڵی بـە دیـواری تەویلەکـەدا دابـوو. لەلایـەکی ئـەم زنجـە بـچکۆلانەیەوە پەنجەرەیـەکی چوارگۆشـە هـەبوو، لەلایەکـەی تریـشیدا دەرگایـەکی باریکەلـەی تەختـە هـەبوو کـە دەچـووە نـاو تەویلەکـە. چـەرپایەکەی کرووکـسی سـنووقێکی درێژکۆڵـە بـوو لـە پـووش و پـەلاش تـژی کرابـوو و لەسەریـشیدا بەتانییـەکانی فڕێـدرابوون. لەسـەر ئـەو دیـوارەی لای پەنجەرەکـەوە چـەند سـنگێك داکوترابـوون، ڕەخـت و کەلوپـەلی شـکاویان بەسـەردا هەڵواسـرابوون و بـۆ چـاککردنەوە ئامـادەکرابوون، هەنـدێك قایـشی چـەرمی تازەشـیان پیـادا هەڵواسـرابوو، ڕێـك لـەژێر پەنجەرەکـە خۆیـشیدا مێزێکی بـچووك بـۆ ئـەو ئامرازانـە دانرابـوو کـە لـە کـاتی ئـیش کردن بـە پێـستەو چـەرم بـەکاردەبرێن، وەکـو جۆرەهـا چـەقۆی چـەماوەو دەرزی و شـووژن و گلۆڵـە دەزووی کـەتان و مەکینەیـەکی دەسـتی پەرچـکردنیش، کـە هـەموو ئەمانـەی لەسـەردا ڕیزکرابـوو. بێجگـە لەمـەش لەسـەر سـنگەکاندا هەندێ پارچـە ڕەخـت و ئەسـپابی تـریش هەڵواسـرابوون، ئەوانـە تـەوقێکی هـەڵزڕاو کـە مـووی ئەسـپی

ناواخنەکـــەی لێیـــەوە دەرپـــەڕیبووە دەرەوە، هەوســـارێکی پـــچڕاو و زنجیرێکـــی ڕاکێشانی گالیسکە بەو چەرمە تلیشاوەیەوە کە دایدەپۆشیێ.

کـــرووکس لەســـەرووی چـــەرپایەکەیەوە: ســـتووقە ســـێوەکەی خـــۆی هەڵواســـی بـــوو، لـــە ناویـــشیدا کۆمەڵـــە شووشـــەیەکی داو دەرمـــانی هەمـــەجۆر بـــۆ خـــۆی و بـــۆ ئەســـپەکانیش هـــەبوو. چـــەند دانـــە قتوویـــەك ســـابوونی خـــاوێن کردنـــەوەی زیـــن و قتـــووە قـــەترانێکی لەملاولـــەولاوە چـــۆرِە کـــردویش لەگـــەڵ فلـــچەکەیدا کـــە لـــە لایەکییـــەوە دەرپـــەڕیبووە دەرەوە لـــەوێ دانرابـــوون. لەســـەر عەرزەکەیـــشدا چـــەند دانـــە شـــتێکی تایبـــەت بـــەخۆی پـــەرت و بلاّوبووبونـــەوە، لەبـــەر ئـــەوەیش کـــە بەتـــەنیا بـــوو، کـــرووکس گـــوێی نـــەدەدایێ و شـــتەکانی هـــەروا پـــەرش و بـــلاّو بەجێدەهێـــشت، هـــەروەها لەبەرئـــەوەیش کـــە مەیتـــەر بـــوو، ســـەقەت و ناتـــەواویش بـــوو، نیـــشەکەی ئەویش لـــە ئیـــشی پیاوەکـــانی تـــر درێژخایـــەن تـــر بـــوو، بۆیـــە شـــت و مـــەکی زۆر لـــەوە زیاتری کەڵەکە کردبۆو کە بتوانێ هەڵی بگرێ.

کـــرووکس چـــەندین جـــوت پـــێلاّو، و جـــوتێ بـــوتی لاســـتیکیی و ســـەعاتێکی گـــەورەی خەبـــەر کـــەرەوە و تفـــەنگێکی تـــاك لوولـــەش هـــەبوون. هـــەروەها کۆمـــەڵێك کتێـــب و فەرهـــەنگێکی شـــڕو وڕو کتێبێکـــی کـــۆنی یاســـای مـــەدەنی کالیفۆرنیـــای ســـاڵی ١٩٠٥ و چەند گۆڤـارێکی شـڕۆڵ و چەند دانـە کتێبێکـی پـیس و پۆخـڵ لەسـەر ڕەفێکـی تایبـەتی لەســـەرووی چـــەرپایەکەیەوە دانرابـــوون. چـــاویلکەیەکی چوارچـــێوە زێـــڕینیش بـــە بزمارێکەوە هەڵواسرابوو کە لەسەر دیوارەکەی سەرووی بالینگەکەدا داکوترا بوو.

ئـــەم ژوورە گـــسك دراوو تاڕادەیـــەکیش پـــاکو خـــاوێن بـــوو، چـــونکە کـــرووکس پیـــاوێکی ڕێـــك و پێـــك و تـــەریك بـــوو. هەمیـــشە خـــۆی لـــەوانی تـــر بـــەدووردەگرت و ســـووربوو لەســـەر ئـــەوەی کـــە خـــەڵکیش خۆیـــان لـــەو بـــەدووربگرن. بـــەژنی بـــەهۆی بڕبـــڕە کۆماوەکەیـــەوە بـــەرەو لای چـــەپ کـــووڕ ببـــووەوەو چاوەکانیـــشی قـــووڵ بـــە هێلوونەکانیانـــدا ڕۆچـــبوون و لەبـــەر قووڵییەکانیـــشیان وا دەردەکـــەوتن کـــە زۆر بـــە تونـــدی دەبریـــسکێنەوە. دەموچـــاوە باریکەکەشـــی بـــە کۆمەڵـــە چرچولۆچـــییەکی

ڕەشــی قــوڵ ژاکــابوو، هــەروەها دوو لێــوی تــەنکی نــێش و نــازار داخــستووی هەبوو کە ڕەنگیان نەختێك لە ڕەنگی سیمای کاڵتر بوو.

ئــەو شــەوە شــەوی شــەممە بــوو، لــەو دەرگــا ئاوەڵایــەی کــە دەچــووەوە نێــو تەویلەکــە دەنگــی جووڵانــەوەی ئەسپەکان و تەقــەی جاروبارجەنجاڵی ناڵەکان و دەنگــی ملــچە ملــچی کــا کرۆژتنــی دانــەکان و قرتــە قرتــی ڕەشمــە ئاسنینەکان دەهاتنــە بــەرگوێ. لــە ژووری مەیتەرەکــەدا گڵــۆپێکی کارەبــایی بــچکۆلە ڕووناکییەکی زەردیلەی کزی پەخش دەکردەوە.

کــرووکس لەسەرچــەرپایەکەیدا دانیــشتبوو. کراســەکەی لــەدواوە لــەناو پانتۆڵــە جینزەکەیـــەوە دەرهـــاتبووە دەرێ. بەدەســـتێکی شووشـــەیەك ڕۆنـــی گرتبـــوو بەدەســتەکەی تریــشی بربــڕەی پــشتی خــۆی دەشــێلا. جارناجــارێ چــەند دڵۆپەیــەکی لــە ڕۆنەکــە دەکــردە نێــو لــەپی دەســتە پەمەییەکــەی و لــەژێر کراســەکەیەوە درێــژی دەکــردە ژوورەوەو دیــسانەوە خــەریکی شــێلانی پــشتی دەبــوو. کــە ئەوەشــی دەکــرد ماسوولکەکانی کرژو توورت دەبوون و مچوورکێکی پیادا دەهات.

لێنـــی بـــەکرپکپی لــەنێو دەرگاکراوەکـــەدا دەرکـــەوت و لـــەوێ وەســـتا و ســـەیری ژوورەوەی کــرد، شــەپیلکە گــەورەو پانوپۆڕەکــانی هێنــدەی نــەمابوو هــەموو بۆشــایی نێــو دەرگاکــە پربکەنــەوە. بــۆ ســاتە وەختێــك کــرووکس ئــەوی نــەدیت، بــەڵام کــاتێ کــە چــاوەکانی هــەڵبڕی وشــك هەڵگــەڕاو مڕومۆچــییەك رووخــساری داگرتــەوە و دەستیــشی لـــەژێر کراســـەکەیەوە هێنایـــە دەرەوە. لێنــیش دۆشــداماوانە زەردەخەنەیـــەکی کـــرد وەك بلێـــی هـــەوڵ بـــۆ ئـــەوە دەدات ببێتـــە هـــاوڕێی. کرووکـــسیش بـــە تونـــدو تیژییەکـــەوە پێـــی وت: " تــۆ مــافی ئــەوەت نییــە بێیتــە نــاو ژوورەکەمـــەوە. ئەمــە ژووری تایبــەتی منــە و هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە بێتــە ئێرە هەر تەنها خۆم نەبێ."

لێنـــی تفـــی قـــوت داو خەندەکەشـــی شـــێوەیەکی مـــەرایی کەرانـــەی زیـــاتری گرتـــەخۆ و نـــا ئەمـــەی وت: " مـــن هـــیچ ناکـــەم، هـــەر بـــۆ ئـــەوە هـــاتم ســـەیری توتەڵەکەم بکەم.. رووناکی ژوورەکەتم بینی و هاتمە ژوورەوە."

"ئـێ خـۆ مـتافی ئـەوەم هەیـە ژوورەکـەم رۆشـن بکەمـەوە. دەی.. بـرۆ لـە ژوورەکەم دەرچـۆ دەرەوە. ئێوە ناتانـەوێ مـن بێمـە خـانووی کرێکارانـەوەو منـیش نامەوێ ئێوە بێنە ژوورەکەمەوە."

لێنی وتی: " بۆچی نایانەوێ بچێتە ئەوێ؟"

"لەبەرئـەوەی مـن قولەرەشـم.. ئەوانـە ئـەوێ لەگـەڵ یەکـدا یـاری کاغـەزێن دەکـەن، بـەڵام مـن نـاتوانم یـاری بکـەم، چـونکە مـن قولەڕەشـم و دەڵـێن بـۆنی بۆگـەنم لێـدێت. بەڵام با شتێکت پێ بڵێم، بەرای من ئێوە خۆتان بۆنی بۆگەنتان لێ دێت."

لێنـی کەساسـانە دەسـتە بێهاوتاکـانی خـۆی شـۆڕکردەوەو وتـی: " هـەموویان بۆنـاو شـار چـوون، سـلیم و جـۆرج و هـەموو ئـەوانی تـریش رۆیـشتن. جـۆرج وتـی مـن دەبـێ لێـرە بمێنمـەوە و خـۆم تووشـی گێروگرفـت نەکـەم. منـیش روونـاکی ژوورەکەتم بینی و..."

"ئێ باشە چیت دەوێ؟"

"هیچ... هەر روناکی ژوورەکەتم بینی و وابیرۆچووم دەتوانم بێمە ژوورەوە و دانیشم.."

کـرووکس چـاوی بڕییـە لێنـی و دەسـتی درێـژکردو لـە پـشتییەوە چـاویلکەکەی داگـرت و لەسـەر گوێـچکە پەمەییـەکانی گـیری کـردو دیـسان چـاوی بڕییـەوە لێنـی و بەنارەزاییەکەوە وتـی: " بەراسـتی مـن نـازانم تـۆ لـە تەویلەکـەدا چـی دەکـەیت. خـۆ تـۆ قەتارچـی نیـت. هـەروەها هـیچ پێویـستیش بـەوە ناکـات مەیتـەرێك بێتـە نـاو تەویلەکە. خۆ تۆ قەتارچی نیت.. و هیچ پەیوەندییەکیشت بەئەسپەکانەوە نییە."

لێنیش دووپاتی کردەوەو وتی: " تووتکەکە.. هاتم بۆ ئەوەی تووتکەکەم ببینم."

"دەباشـە کەواتـە بـرۆ تووتکەکـەت ببینـەو مەیتـەرە شـوێنێکەوە کـە خاوەنەکەی نایەوێ بچێتە ناوییەوە."

لێنـی زەردەخەنەکـەی خـۆی لەدەسـتداو هـەنگاوێك بـەرەو نێـو ژوورەکـە چـوو، بـەڵام هاتـەوە بـیری و دووبـارە بـەرەو دەرگاکـە پاشەکـشەی کـردەوەو وتـی: " نـەختێك سەیرم کردن.. سلیم دەڵێت، نابێ زۆر نەوازشیان بکەم و دەستیان لێ بدەم."

کرووکس وتی: " کەواتە بەردەوام لە لانەکە دەرت کردوون. سەرسامیشیم لەوەی کە چۆن دێڵە سەگەکە بۆ شوێنێکی دیکە نایانگوازێتەوە."

"نۆو.. گوێی ناداتێ.. بوارم دەداتێ." لێنی ئەمەی وت و جارێکی تر بەرەو نێو ژوورەکە ملی نا.

کرووکس چرچاوی تێکناو رووی گرژکرد، بەڵام زەردەخەنە رق رەوێنەرەکەی لێنی بەزاندی و ناچار وتی: " دە وەرە ژوورەوە.. وەرە بۆ خۆت تۆزێک دانیشە.. بەمەرجێك نەچیتە دەرەوەو تاق و تەنیا بەجێم نەهێڵیت، وەرە باشتر وایە دابنیشیت." دەنگی نەختێك لە پێشوو دۆستانەتر بوو، درێژەی دایێ و وتی: " کەواتە گورگەل هەموویان بۆناوشار رۆیشتن؟"

"هەموویان رۆیشتن هەر تەنها کاندیە پیر نەبێ. هەروا لە خانووی کرێکاران دانیشتووەو پێنووسەکەی دادەدات و حیساب و کیتاب دەکات."

کرووکس چاویلکەکەی چاك کردو وتی: " حیساب و کیتاب دەکات؟ کاندی حیساب و کیتابی چی دەکات؟"

لێنیش دەنگی بەرز کردووەو وەك بڵێی هاوار بکات وتی: " حیساب و کیتاب دەربارەی کەروێشکەکان دەکات."

کرووکسیش وتی: " تۆ شێتی، تۆ شێتێکی ناوازەی. تۆ دەربارەی کەروێشکی چی قسە دەکەیت؟"

"دەربارەی ئەو کەروێشکانەی کە دەستەبەریان دەکەین و منیش بەخێویان دەکەم، گیایان بۆ دەبڕمەوەو ئاویان دەدەمێ و شتی لەو جۆرە."

کرووکسیش وتی: " بەڕاستی تۆ شێتی، هیچ لۆمەی هاورێکەت ناکەم کە لەبەرچاو ناتهێڵێ و دوورت دەخاتەوە."

لێنیش بە هێمنییەکەوە وتی: " درۆ ناکەم. ئەوە دەکەین. جێگایەکی بچکۆلانە بۆخۆمان دەکرین و بە بەروبوومەکەی وەکو خواپێداوان دەژین."

کرووکسیش لەسەر چەرپایەکەیدا خۆی ئاسوودەتر جێگیرکردو وتی: " دانیشە.. لەسەر بەرمیلی بزمارەکان دانیشە."

لێنــی داچــەمییەوە و لەســەر بەرمیلــە بــچکۆلەکەدا دانیــشت و وتــی: " تـۆ وا دەزانی درۆیە، بەلاّم درۆ نییە. هەمووی ڕاستەو دەتوانی لە جۆرجیش بپرسی."

کــرووکس چــەناگە ڕەش و تۆخەکــەی خــستە نێــو لەپــە پەمەیــەکانی و وتــی: " تۆ یاوەری جۆرجی.. وانییە؟"

"بەڵێ من و ئەو پێکەوە بۆ هەموو شوێنێك دەچین."

کرووکسیش درێـژەی دایـێ و وتـی: " جاروبـار قـسەت بـۆ دەکـات، بـەلاّم تـۆ نازانیت ئەو دەربارەی چی دەدوێت. وانییە؟"

"بەڵێ.. جاروبار وایە..."

"ئەو هەر بەردەوام دەبێ لە ئاخاوتن و تۆیش نازانیت باسی چی دەکات؟"

"بەڵێ جاروبار.. بەلاّم... بەردەوام وانییە."

کــرووکس بـۆ پێـشەوە، بەســەر قــەراخی چــەرپایەکەیدا نووشــتایەوەو وتــی: " مــن لــە قولەڕەشــەکانی باشــوورنیم، مــن لێــرە لــە کالیفۆرنیــا لــەدایك بوومــە. بــاوکم کێڵگــەی پــەروەردە کردنــی پەلــەوەری هــەبوو، ڕووبەرەکــەی دە ئەیکــەر بــوو. منداڵــە ســپییەکانیش بـۆ یـاری کـردن بـۆ ئـەو جێگایـەی ئێمـە دەهـاتن و هەنـدێجاریش مـن دەچـووم بـۆ ئـەوەی یارییــان لەگەڵــدا بکــەم و بەڕاســتیش هەنــدێکیان زۆر پوختــەو ڕێــك و پێــك بــوون. کەچــی بـاوکم ئـەوەی بـەدڵ نـەبوو. منـیش تـا ماوەیـەکی دوورودرێـژ پـەیم بـەوە نـەبرد کـە بۆچـی ئـەو شـوێنەی بـەدڵ نـەبوو. بـەلاّم ئێـستاکە دەرکـی پێدەکـەم." ئینجـا قـەدەرێك ڕاوەسـتا و دواتــر کــاتێ کــە دووبــارە قــسەی کــردەوەو دەنگــی ســازگارتر و ناســك تــر بــوو، بــە پێکەنینــەوە وتــی: "بــە دووری چــەندەها میــل نــە دەورووبــەری ئــەو جێگایــەدا خێزانێکــی دیکــەی ڕەشپێــست نــەبوو. وەکــو دەبینــی لەســەر ئــەم مەزرایەشــدا پیــاوی ڕەشپێــست نییــەو هــەر تــەنها یــەك خانــەوادەش لەسەرانــسەری سـۆلیداد دا هەیــە. ئەگــەر مــن شــتێك بڵێم چ بایەخێکی هەیە، خۆ بەلای تۆوە هەر قۆڵەڕەشێکە دەدوێت و هیچی تر.."

لێنـی لێـی پرسـی: " بـەڕای تـۆ چـەنێکی پێـدەوێ هـەتا ئـەو توتەلاّنـە هـەراش دەبن و ئامادەی ئەوە دەبن کە نەوازش بکرێن؟"

کرووکس هەمدیس پێکەنییەوەو وتی: " پیاو دەتوانێ قسەت لەلادا بکات و لەوە خاترجەم بێت کە دەم شڕیی ناکەیت و نایگێڕیتەوە. هەر دوای دوو هەفتە ئەو توتەلانە لە خەم دەرەخسێن. جۆرج دەزانێ چی دەڵێت. بەلام کە قسەت بۆ دەکات تۆ هیچی لێ حالی نابیت." ئەوسا بە جۆشێکەوە داچەمایەوەو وتی: " بێ خەیاڵ بە، چونکە ئەمە هەر تەنها قسەی قولەڕەشێکە، قولەڕەشێکی پشت شکاو. بۆیە هیچ مانایەکی نییە، تێدەگەی؟ بەهەرحاڵ خۆ لەیادت نامێنێتەوە. من جارەهای جار بینیوومە کە پیاوێك بۆ پیاوێکی تر دەدوێت و هیچ جیاوازییەك ناخاتە ئاراوە ئەگەر ئەو گوێی لێ نەبێ ۆ تێینەگات. گەوهەری شتەکە هەر ئەوەیە کە پێکەوە گفتوگۆ دەکەن، یاخود پێکەوە مەنگ و خامۆش دانیشتوون و ورتەیان لێوە نایەت. بەلام لە ڕاستیدا هیچ جۆرە جیاوازییەك ناخاتە ئاراوە... بەڕاستی هیچ فەرق ناکات." پاشان حەماسەتەکەی هێندە زیادی کرد کە بە دەست کەوتە کێشان بە ئەژنۆی خۆیداو وتی: " جۆرج دەتوانێ شتی سەیرو عاجباتیت بۆ باس بکات، بەلام چ سوودێکی هەیە؟ مەسەلەکە هەر ئاخاوتنەکەیەو هیچی تر. هەر بوونە لەگەڵ کەسێکی تردا.. هەر ئەوەیە و هیچی تر.." ئینجا هەڵومستەیەکی کردو دەنگی ناسکترو قایلکەرانەتر هەنگەڕاو وتی: " گریمان جۆرج ئیتر ناگەڕێتەوە. گریمان لەناکاو ڕۆیشت و ئیتر هەرگیز نایەتەوە. ئەو کاتە چی دەکەیت؟"

ئەوەی کە وترابوو هێدی هێدی سەرنجی لێنی ڕاکێشاو بە توندو تیژییەوە وتی: " چی؟"

"وتم گریمان ئەمشەو جۆرج چووە ناوشارو چیدی هیچ شتێکت لە بارەیەوە نەبیست."

کرووکسیش کە بە جەسارەتەوە پەیگیریی لەسەر جۆرە سەرکەوتنێکی تایبەتمەند دەکرد دووپاتی کردەوەو وتی: " هەر تەنها وا دابنێ."

لێنی شیتاندنی: " ئەو شتی وا ناکات، جۆرج هیچ شتێکی لەو جۆرە ناکات. من زۆر دەمێکە لەگەڵ جۆرج دام. ئەمشەو دەگەڕێتەوە..."

بەهۆی ئەشکەنجە بینینی لێنییەوە ئۆخژن چارەی کرووکسی دەرەوشاندەوەو وتی: هیچ کەسێك ئەوە نازانێت کە پیاوێك خواستی چی هەیە و بەتەمای

چییه،" ئەمەی وت و بەهێمنییەکەوە سەرنجی دا، ئینجا درێژەی دایێ و وتی:
" دەی با وا دابنێین کە دەیەوێ بگەڕێتەوە و ناتوانێت. گریان دەکوژرێت یاخود بریندار دەکرێت بۆیە ناتوانێت بگەڕێتەوە."

لێنی کێشمەکێشی دەکرد تێبگات. دووبارە وتییەوە: " جۆرج هیچ شتێکی لەو جۆرە ناکات. جۆرج زۆر بە ئاگاو وریایە. هیچی بەسەرنایەت، هەرگیز هیچی بە سەرنەهاتووە، چونکە بە ئاگاو وریایە."

"دەباشە، گریمان، وای دابنێ کە نەگەڕایەوە. ئەوسا تۆ چی دەکەیت؟"

دڵەڕاوکێ ڕووخساری لێنی پڕکرد لە چرج و لۆچی و قیژاندی: " نازانم. هەرچی چۆنێکە تۆیلێ، تۆ خۆت چی دەکەیت؟ ئەمە هیچی ڕاست نییە. جۆرج هیچی بەسەر نەهاتووە."

کرووکس فشاری زیاتری خستە سەری و وتی: " دەتەوێ پێت بڵێم چی ڕوودەدات؟ دەتبەن بۆ شێتخانە و وەکو سەگ بەتەوقێك شەتەکت دەدەن."

لەناکاو دا چاوەکانی لێنی ئەبڵەق بوون و دەمێك سرەوتی گرت و ئینجا وەکو شێت و هار هەستایە سەرپێ و بەشێوەیەکی ترسناکانە بەرەو لای کرووکس هەنگاوی ناو بە تووڕەییەوە لێی پرسی: " کێ جۆرجی ئازار داوە؟"

کرووکس هەستی بە نزیك بوونەوەی هەڕەشە و کارەسات کردو بۆ ئەوەی لە ڕێگاکە دوورکەوێتەوە لەسەر چەرپایەکەی خۆیەوە پاشەکشێی کردە دواوەو وتی: " هەر تەنها گریمانم دەکرد، جۆرج هیچی بەسەر نەهاتووە. جۆرج ساخ و سەلیمە و بە سلامەتیش دەگەڕێتەوە."

لێنی لەسەرسەری دا وەستاو وتی: " ئەی ئیتر بۆچی وا دادەنێی ؟ نامەوێ هیچ کەسێك گریمانەی ئەوە بکات کە شتێك بەسەر جۆرج هاتووە."

کرووکس چاویلکەکەی لابردو بە پەنجەکانی چاوەکانی هەڵگلۆفت و وتی:
" دە دانیشە ئیتر، خۆ جۆرج هیچی لێ نەهاتووە."

لێنی بە منگە منگ چووەوە جێگاکەی خۆی کە لەسەر بەرمیلی بزمارەکەدا بوو و بەپرتەوبۆڵە کردنەوە وتی: " نامەوێ هیچ کەسێك باسی ئازاردانی جۆرج بکات."

کرووکسیش بەناسکی و میهرێکەوە وتی: " لەوانەیە ئێستا باشتر لەوە تێبگەیت کە جۆرجت هەیە. تۆ دەزانی کە ئەو هەر دەگەڕێتەوە. بەلاَم گریمان کەست نەبوایە، گریمان نەتتوانیبایە بچیتە ناو خانووی کرێکاران و یاری "ڕوومی"(١) بکەیت، چونکە قونەڕەشیت. ئایا ئەوەت بەدڵ دەبوو؟ گریمان ناچار بوویت لێرە دابنیشیت و موتالاَی کتێب بکەیت. ڕاستە دەتوانیت هەتا تاریك داهاتن یاری ئاڵنالێن بکەیت، بەلاَم دوای ئەوە هەر دەبێ کتێب بخوێنیتەوە. کتێبیش هەموو شتێك نییە. سەرەنجام مرۆڤ پێداویستی بە کەسێك هەیە لێیەوە نزیك بێت." ئەنجا نووزە نووزێکی لێوە هات و بەردەوام بوو: "مرۆڤ ئەگەر کەسێکی نەبێت شێت دەبێت. هیچ گرنگ نییە ئەو کەسە کێیە، مادەم لەگەڵ تۆدایە.. تەواو. باپێت بڵێم"، بەهاوارەوە وتی: " باپێت بڵێم پیاو زۆر هەست بە تەنیایی دەکات و تێك دەچێت."

لێنی بە دەنگێکی ترس لێ نیشتوو خۆی دڵنیا کردەوەو وتی: " جۆرج هەر دەگەڕێتەوە. ڕەنگە نێستاکە جۆرج هاتبێتەوە. وا چاکە بچم بزانم."

کرووکس وتی: " من مەبەستم ترساندنی تۆ نەبوو. بێگومان جۆرج دێتەوە. من دەربارەی خۆم دەدوام. کەسێك بهێنەرە بەرچاوت شەوانە بەتاق و تەنیا لێرە دادەنیشێت، لەوانەیە کتێب بخوێنێتەوە یاخود بیربکاتەوە یان شتی لەو جۆرە. هەندێ جار بیردەکاتەوە، بەلاَم هیچی نییە پێی بڵێت. ناتوانێ پێی بڵێت چی باشە و چیش باش نییە. ڕەنگە ئەگەر شتێکت ببینێت نەزانێت داخۆ ئەو شتە خۆیەتی یاخود شتێکی ترە. ناشتوانێ پەنا بۆ کەسێکی تر ببات و لێی بپرسێ ئایا ئەویش هەر ئەو شتە دەبینێ. ناتوانێ هیچ بڵێت.

---

(١) جۆرەیارییەکە بەدەستە کاغەزی پۆکەر دەکرێت.

هـیچ پێـوەرێکی بـۆ شـتەکان نییـە. شـتی زۆرم لێـرە بینیـووە، هەڵبـەتا سـەرخۆش نەبوومە. نازانم ئـاخۆ لـە خـەودا بینیوومـە یـان نـا. ئەگـەر کەسـێکی تـر لەگەڵمـدا بوایـە ئـەوا دەیتـوانی پـێم بڵـێ خـەوتبووم، ئەوسـایش شـتێکی ئاسـایی بـوو گـوێم نـەدەدایێ. بـەڵام مـن ئێـستا کـە نـازانم." کـرووکس تەماشـای ئـەو بـەرەی ژوورەکەی دەکرد، لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد.

لێنـی بـە غـەمگینیەکـەوە وتـی: " جـۆرج بـۆ هـیچ شـوێنێك نـاڕوات و مـن بـە تەنیا بەجێ ناهێڵێت. من دەزانم جۆرج ئەو شتە ناکات."

مەیتەرەکـە خەونئامێزانـە لەسـەری ڕۆیـشت و وتـی: " دێتـەوە بـیرم لـە مەزراکـەی بـاوکم دا منـداڵێکی بـچکۆلانە بـووم و دوو بـراو هـەبوون. هـەردەم لـە دەوروبـەرم بـوون، هەمیـشە لـە پاڵمـدا بـوون. هەرسـێکمان لـە هـەمان ژووردا ولـە نێـو هـەمان جێخـەودا دەخـەوتین. پارچـە عـەرزێکمان هـەبوو هـەمووی داری چـەلیك بـوو، پارچـە عەرزێکیـشمان هـەبوو هـەمووی وێنجـە بـوو. ڕاهـاتبووین بـەیانیانی ڕۆژە هەتاوییـەکان مریـشکەکانمان بـەرەلای نێـو وێنجەکـە دەکـرد. براکـانم لەسـەر پەرژینەکـەدا دادەنیـشتن و چاودێرییان دەکردن... هەر هەموو مریشکەکانمان سپی بوون."

نەختـە نەختـە سـەرنجی لێنـی بەرجەسـتەی ئـەوەی دەکـرد کـە دەوتـرا. پاشـان وتی: " جۆرج وتی پارچە زەوییەکی وێنجەمان دەبێت بۆ کەروێشکەکان."

"کەورێشکی چی؟"

"کەروێشکمان دەبێت و پارچە زەوییەکیش بۆ دارتووی فەرەنگیی."

"تۆ شێتی."

"بەخوا دەمان بێت.. ئەگەر باوەڕیش ناکەیت لە جۆرج بپرسە."

کـروکس بەکـەمیی و سـووکییەوە سـەیری کـردو وتـی: " تـۆ شـێتی. مـن سـەدان پیاوم بینیـووە کـە بێرەدا تێپـەڕیون یـاخود بـۆ ئـەم مەزرایانـە هـاتوون، بارگـەو بنـەیان بـە کۆڵـەوە و لـە ناوەزیـشیاندا هـەمان ئـەو بیرۆکـە نەعلەتییانـە هـەبووە. سـەدانی لـەو بابەتـەم دیتـوون. دێـن و دواتـر واز دەهێـنن و دەڕۆن و لـە ئـاوەزی هـەر یەکەیـشیاندا

پارچە عەرزێکی بچکۆلانە هەیە. قەتاو قەتیش هیچ کەسێکیان بەرزەفتی ناکات، رێك وەکو چۆن کەسیان بەرزەفتی بەهەشت ناکەن، ئەئاوا. هەموو کەسێك پارچە عەرزێکی بچکۆلانەی دەوێت. من ئالێرەدا کتێب گەلێکی زۆرم خوێندووەتەوە و کەس هەرگیز ناگاتە بەهەشت و کەسیش پارچە عەرز دەستەبەر ناکات. ئەوە شتێکە هەر تەنها لە هزریاندا هەیە. هەمیشەیش هەر لەبارەیەوە دەدوێن. بەلاّم هەر تەنها لە هزریاندایەو بەس."

ئینجا تۆزێك راوەستاو تەماشای لای دەرگا ئاوەلاکەی کرد، چونکە گوێی لێبوو ئەسپەکان بێ ئۆقرانە رەفتاریان دەکردو ماخۆلانیان تێکەوتبوو و زنجیری قەمتەرەکانیش زرنگەیان لێوە دەهات. ئەسپێکیش حیلاندی. کرووکس وتی: " پێم وابێ یەکێك لەوێیە. رەنگە سلیم بێ، چونکە سلیم هەندێ شەو دوو، سێ کەرەت سەر لە تەویلەکە دەدات. بەراستی سلیم قەتارچییەکی نایابە و زۆریش بەتەنگ چارەوییەکانییەوە دێت."

ئینجا بە ئازارچەشتنەوە خۆی گورج و قیت کردەوەو بەرەو دەرگاکە کشاو بانگی کرد: "سلیم ئەوە تۆی؟"

بەلاّم دەنگی کاندی پاکۆی دایەوەو وتی: " سلیم بۆ ناوشار رۆیشت.. پێم بلّێ لێنیت بینیووە؟"

"پیاوە زل و گەورەکە دەلّێی؟"

"بەلّێ. لەم دەوروبەرە لە هیچ شوێنێك بینیوتە؟"

کرووکسیش بە وشکییەکەوە وتی: " لێرەیە." و ئەوسا گەڕایەوە سەرچەرپایەکەی و راکشا.

کاندی لەنێو دەرگاکەدا راوەستاو کەوتە خوراندنی مەچەکە رووت و قوتەکەی و کوێرانە تەماشای نێو ژوورە رووناکەکەی دەکرد. هیچ تەقەلای ئەوە ئەدا بێتە ژوورەوە، هەر لەوێوە وتی: " لێنی گوێبگرە با شتێکت پێ بلّێم. حیسابێکم دەربارەی کەروێشکەکان کردووە."

کرووکسیش بەبێ تاقەتییەکەوە وتی: " ئەگەر پێت خۆشە وەرە ژوورەوە."

کاندی شەرمەزار دیاربوو، وتی: " نازانم.. بەلاّم بێگومان ئەگەر حەز بکەیت بێمە ژوورەوە و هیچ لاریبەکت نەبێ."

بۆ کرووکس زۆر ئەستەم بوو خۆشحاڵییەکەی خۆی بە رق و تووڕەیی پەردەپۆش بکات، بۆیە وتی: " دە وەرە ژووریّ... ئەگەر هەموو کەسێك بتوانیّ بێتە ژووریّ، ئەوا تۆیش بۆت هەیە بێیتە ژووریّ."

کاندی هاتە ژوورەوە، بەلاّم هێشتایش هەر شەرمەزار بوو. بە کرووکسی وت: " بۆ خۆت لێرە جێگایەکی خنجیلانەی خۆش و جوانت هەیە. ڕەنگە زۆر خۆش بێت ئەگەر بەم چەشنە ژوورێکت هەر تەنها بۆ خۆت هەبێ."

کروکسیش وتی: " بێگومان خۆشە.. بەو کەلّەکە شیاکەیەی ژێر پەنجەرکەشەوە.. بێگومان شوێنێکی خۆش و نایابە."

لێنیش هاتە نێو وتووێژەکەوەو وتی: " تۆ لە بارەی کەروێشکەکانەوە دوایت."

کاندیش پاڵی بە دیوارەکەی تەنیشت تەوقێکی شکاوەوە داو لە کاتێدا کە کۆتەرەی مەچەکی دەخوراند وتی " من زۆر دەمێکە نالێرەدام. کرووکسیش زۆر دەمێکە لێرەدایە. بەلاّم ئەمە یەکەمین جارە کە من ژوورەکەی ببینم."

کرووکسیش بەشێوەیەکی ناڕوون و نێلّ وتی: " پیاوەکان هیچ ناچنە ژووری ڕەشپێستێکەوە. هەتا ئێستا هیچ کەسێك نەهاتووەتە ئێرە هەر تەنها سلیم نەبێت. هەر تەنها سلیم وسەرکارەکە هاتوونەتە ئێرە."

کاندی بە پەلە بابەتەکەی گۆڕی و وتی: " سلیم باشترین قەتارچییە کە هەرگیز بینیبێتم."

لێنیش بەرەو لای پیرەخزمەتکارەکە نوشتایەوەو بە سووربوونەوە وتی: " ئێ، چیت دەربارەی ئەو کەروێشکانە دەوت؟"

کاندیش بزەیەکی کردو وتی: " لێکم دایەوەو حیسابم کرد.. دەتوانین لەو کەروێشکانە قازانج بکەین ئەگەر بتوانین بە دروستیی پەروەردەیان بکەین."

لێنــی هەڵقورتایــە نێــو قــسەکەوە و وتــی: " بــەڵام مــن دەبــێ پــەروەردەیان بکەم. جۆرج خۆی بەلێنی داو وتی من دەبێ پەروەردەیان بکەم."

کرووکــسیش بەتوندوتیژییــەوە قــسەکەی پــێ بــڕی و وتــی: " ئێــوە قەشــەری بــەخۆتان دەکــەن. یــەك دنیــا دەربــارەی ئــەوە قــسە دەکــەن و، بــەڵام نابنــە خــاوەن زەوی و زار. تــۆ هــەتا لــەنێو تەرمێکــدا دەتبەنــە دەرەوە هــەموو ژیانــت لێــرە بەخزمەتــچێتی بەســەردەبەی. خــەڵکێکی زۆری وەك ئێــوەم بینیــووە.. بــۆ نموونــە ئــەم لێنییــە پــاش دوو ســێ هەفتــەی تــر واز لــە ئــیش دەهێنــێ و دەکەوێتــە ڕێ و دەڕوات. بەوە دەچێ کە هەموو کەسێك پارچە زەوییەکی لە زەیندا هەبێت."

کانــدی بــە تووڕەییــەوە لاڕوومــەتی خــۆی خورانــد و وتــی: " تــۆ بێخــەم بــە.. ئێمــە ئەم پڕۆژەیە هەردەهێنینە دی. جۆرج وتی دەیکەین. پارەکەیشمان ئامادەیە."

کرووکــسیش وتــی: " بەڕاســتە؟ دە باشــە.. ئــەی جــۆرج ئێــستا لــە کوێیــە؟ لــە قەحپەخانەیــەکی ناوشــاردایە. کەواتــە ئالەوێــدا پارەکــەتان بــە فــیڕۆ دەچــێت. مــن زۆر زۆر ئەمــــەم بینیـــووە ڕوویـــداوە و دووبـــارە بووەتـــەوە. پیاوگـــەلێکی زۆرم دیتـــووە کـــە لـــە ناوەزیانـــدا هەرتـــەنها پارچـــە زەوییـــەکیان هـــەڵگرتووە، بـــەڵام هەرگیز هیچ شتێك ناکەوێتە ژێر دەستیان."

کانــدی بــە دەنگێکــی بلنــدەوە وتــی: " بێگومــان هــەموو کەســێك بــە ئــاواتی ئەوەوەیــە. هــەموو کەســێك ئــاواتی ئەوەیــە ببێتــە خــاوەن پارچــە زەوییــەکی بــچکۆلانە، نەك گــەورە. شــوێنێك بێــت بــەڵام هێنــی خــۆی بێــت. هــەر شــوێنێك بێــت لەســەریدا بــژێت و هــیچ کەســێکیش نــەتوانێت تیــای دەری بکــات. مــن هــەرگیز شــوێنێکی وام نــەبووە. مــن تەقریبــەن بــۆ هــەموو کەســێکی ئــەم هەرێمــە دەغــڵ و دانم چــاندووە، بــەڵام دەغڵــودانی خــۆم نــەبوون و کــاتێکیش کــە درووێنــە کــراون بــەرووبوومی مــن نــەبوون. بــەڵام ئــەم پڕۆژەیــە هــەر ڕادەپــەڕێنین و بێگومــانیش بــە دەربــارەی ئــەوە، چــونکە هــەر دەیکــەین. جــۆرجیش پارەکــەی بــۆ شــار نــەبردووە. ئــەو پارەیــە لــە بانکدایــە. مــن و لێنــی و جـــۆرجیش هەریەکـــەمان ژووری تایبـــەتی خۆمـــان دەبـــێ، ســـەگێك و کۆمـــەڵێك

کەروێشك و مریشکمان دەبێت. دانەوێڵەی کەسکمان دەبێت و لەوانەیە مانگایەك یاخود بزنێکیشمان هەبێت." پاشان فرە بە بەرجەستەکردنی ئەو شتانە لە هزری خۆیدا سەرسام و کاتێکراو بوو و لە دوان کەوت.

کرووکس لێی پرسی: " تۆ وتت پارەتان هەیە؟"

"بەڵێ زۆربەیمان هەیە. هەر تەنها پێویستمان بە هەندێکی تر هەیە. ئەوەیشمان لە ماوەی مانگێکدا دەستگیر دەبێت. جۆرجیش مەزراکەی بینیووە و دەست نیشانی کردووە."

کرووکس دەستی بۆ پشتەوە درێژکردو بڕبڕەی پشتی خۆی بەسەر کردەوەو وتی:

"من هەتا ئێستا پیاوێکی وام نەبینیووە ئەمەی ئەنجام دابێت. خەڵکێکی زۆرم بینیووە تاسەی زەوی پەیداکردن تێکی داون و شێت بوونە، کەچی هەموو کاتێك ماڵە سۆزانییەك یاخود یارییەکی "بلاك جاك" پارەکەیانی لووش داوە." قەدەرێك بێدەنگ بوو ئینجا وتی:

"... ئەگەر ئێوە... ئاتاجتان بە کرێکارێك هەیە هەروا بە هەوانتە ئیشتان بۆ بکات... هەرتەنها بەرامبەر بە بژێوییەکەی خۆی، ئەوا من ئامادەم بێم و کۆمەکتان بکەم. من گەنێك پەککەوتەو زورهانیش نیم، ئەگەر بشمەوێ دەتوانم وەك بەراز ئیش راپەڕێنم."

"کوڕینە کێرلیتان بینیووە؟"

هەموو سەریان بەرەو لای دەرگاکە وەرچەرخاند. ئەوەی کە سەیری ژوورەوەی دەکرد ژنەکەی کێرلی بوو. دەموچاوی خۆی بە مەکیاج سواخ دابوو. لێوەکانی بە عاستەم کرابوونەوە. هەناسەبڕکێی بوو وەك بلێی رایکردبێت.

کاندی بە ڕوو گرژییەکەوە وتی: " کێرلی نەهاتووەتە ئێرە."

ئەو لە نێو دەرگاکەدا ڕاوەستاو نەجوولایەوە، ئەختێك زەردەخەنەی بە ڕوویاندا داو بە پەنجە کەڵەو دۆشاو مژەی دەستێکی نینۆکەکانی دەستەکەی تری خوراندو چاوەکانیشی لە دەموچاوێکەوە بۆ دەموچاوێکی تر گواستەوە...

ناکـامیش وتــی: " هـەموو بـێ کەڵکـەکانیان لێـرە هێـشتووەتەوە. پێتـان وایـە مـن نـازانم هـەموو بـۆ کـوێ چـوونە؟ هـەتا کێـرلیش.. مـن زۆر چـاك دەزانم کـە هـەر هەموویان بۆ کوێ چوونە."

لێنـی سەرسـام و بـێ هـۆش تەماشـای دەکـرد، وەلێ کانـدی و کـرووکس بـە مۆنییـەوە لـە عەرزەکـە ڕامـابوون و نەیاندەویـست چـاویان بـە چـاوی بکـەوێت. کانـدی وتـی: " مادامـەکی دەزانـی لـە کوێیـە. ئـەی ئـیتر بۆچـی دێـت لـە ئێمـە دەپرسی کێرلی لە کوێیە؟"

ئـەویش بەکـەیف و خۆشـییەکەوە چـاوی تێیـانبڕی و وتــی: " شـتێکی سـەیرو ڕمۆکـە.. ئەگـەر زەفـەر بەهـەر پیاوێـك بـەرم و تـەنیا بێـت، ئـەوا زۆر بـە باشـی دەتـوانم لەگەڵیـدا ڕەفتاربکـەم. وەلێ ئێگـەرێ بـا دووان لـەو پیاوانـە سـەرینێنە سـەری یـەك و ئێـوەیش نەتانـەوێ مقـۆ مقـۆ بکـەن. بـەڵێ شـتێکی بێمانایـە.. هـەمووی هەرچرپەچـرپەو هیـچی تـر." قامکـەکانی لابـردو دەسـتەکانی لەسـەر سمتـی دانـاو وتـی: " ئێـوە هـەر هـەموتان وەك سـەگ لەیـەك دەترسـن.. ئـەوە هەقیقـەتی ئێوەیـە.. هـەر یـەکێك لـە ئێـوە تۆقیووە نەبا ئەوانی تر شتێکتان لەسەر بگرن و ئابڕوتان بەرن."

پـاش ماوەیـەك بێـدەنگیی کـروکس وتـی: " باشـتر وایـە ئێـستاکێ بـۆ ماڵەکـەی خۆت بگەڕێیتەوە. چونکە ئێمە چەرمەسەری و سەرئێشەمان ناوێت."

"مـن هـیچ نەبوومەتـە هـۆی سەرئێـشە بـۆ ئێـوە. بۆچـی ئێـوە وا دەزانـن کـە مـن جاروبـار حەزناکـەم لەگـەڵ یەکێکـدا بکەومـە گفتوگـۆ؟ بـۆ پێتـان وایـە مـن حەزدەکەم هەمیشە لەو خانووەدا بمێنمەوە؟"

کانـدی کۆتەرەکـەی مەچـەکی خـستە سـەر ئـەژنۆی و بەهێواشـی بەدەسـتەکەی تـری کەوتـە خوراندنی و مـەحکووم کەرانـە وتـی: " تـۆ مێـردت هەیـە... ئـیتر هـیچ پێویـست ناکات تاوی پیاوانی دیکە دەدەیت و کێشە و بەرمیان بۆ دەنێیتەوە."

کـچەکەیش بەمـە هـەژاو بـە تووڕەییـەوە وتـی: " بێگومـان مێـردم هەیـە... هـەموتان بینیوتانـە چ ماڵێکـە..پیـاوێکی ڕێکـو پێکـە وانییـە؟ هـەموو وەختەکـەی بـە

وتنی ئەوەوە بەسەر دەبات کەچی لەو پیاوانە دەکات کە خۆشی ناوێن، ئەفرەتیان لێدەکات، بەلاّم خۆ ئەو هیچ کەسێکی خۆش ناوێت.. پێتان وایە ئالەو خانووە بچکۆلە دوو بە چوارەدا دەمێنمەوە و گوێ لە کێرلی دەگرم کە چۆن چۆنی بە دوو مستەکۆڵەی دەستی چەپی دەستدەکات بە بۆکسێن و ئینجا مستەکۆڵەی دەستی ڕاست دەهێنێتە گۆڕێ؟ چۆن یەك، دوو دەژمێرێت، هەر ئەو یەك، دووە دێرینەی هەمیشەو ئینجا دەکەوێتە سەر عەرز." دوای ئەوە لە گۆکردن وەستاو مرچ و مۆنییەکەی ڕووخساری ڕەوییەوەو سەرنج ڕاکێش هەلگەڕاو وتی: " بەڕاستی پێم بلێن.. دەستی کێرلی چی بەسەر هات؟"

بێدەنگییەکی قورس و شەرماوەر دایگرتنەوە. کاندی دزە نیگایەکی گرتە لێنی و ئینجا کۆکەیەکی کردو وتی: " ئ.. کێرلی... خانم کێرلی دەستی لە مەکینەیەك گیربوو. مەکینەکە دەستی شکاند."

بۆ ماوەیەك چاوی تێبڕی و پاشان قاقا پێکەنی و وتی: " قسەی قۆڕ! تۆ بەتەمای چیم پێبفرۆشیت؟ من دەزانم کێرلی شتێکی دەست پێکردو نەیتوانی تەواوی بکات. لە مەکینە گیربوو، ها..؟.. قسەی قۆڕ! بۆیە ئەو کاتەوەی دەستی شکاوە ئەو یەك، دووە دێرینە نایابەی لەکەس نەسڕەواندووە. کێ دەستی شکاند؟"

کاندیش بە چرچاوێکی گرژەوە وتی: " دەستی لەنێو مەکینەیەکدا گیربوو."

کچەکە بەقێزەوونییەکەوە وتی: " دەی باشە.. باش.. ئێوەش بۆی داپۆشن ئەگەر دەتانەوێ.. بەمن چی؟ هەی دەبەنگی بێکەلك وا دەزانی زۆر زرنگ و چاوکراوەی. بۆ من بەچی دادەنێی، منالّم؟ دەبا پێتان بلّێم ئەگەر من بمویستایە دەمتوانی ببمە ئەکتەرو نوێنەری شانۆ. نەك هەر تەنها یەك دانە شانۆ بەلکو.. پیاوێکیش بەلێنی ئەوەی پێدام ڕۆلێکم لە سینەمادا بۆ دەستەبەر بکات..." و خەریك بوو بە تووڕەیی و شێتگیرییەکەی خۆی خەفە دەبوو"... شەوی شەممان.. هەموو کەسێك بۆخۆی دەچێ بۆ گەڕان و خەریکی شتێکە. هەموو کەسێك! بەلاّم من.. من خەریکی چیم؟ ئالێرە وەستاوم و قسە لەگەڵ چەردە بێناموسێکی ساویلکەدا دەکەم.. لەگەڵ قولەڕەشێکی

شـێتۆکەو پیرەمێردێکـی گێـژو وێـژو خەڵـەفاوی نەسـپێوون دا داخێـوم.. وێـرای ئـەوەیش هەر پێی قایلم، چونکە بێجگـە لەمانـە کەسـی تـر نییـە دەردە دڵـی خـۆمی بـۆ هەڵڕێـژم."
لێنـی بـەدەمی داپـچڕاوەوە چـاودێری دەکـرد. کرووکـسیش بـۆ ئـەودیوو قـاوغی پـارێزەری ئـابڕووی خراپـی قونەڕەشـەکان پاشەکـشێی کـرد. بـەڵام گۆڕانکارییـەکی سـەیر بەسـەر کاندییـە پـێردا هـات. لـە ناکـاودا هەسـتایە سـەرپێ و بـەرمیلی بزمارەکـەی ژێـری تـەکانێکی بـەرەو پاشـەوە خـوارد و بـە تووڕەییـەوە وتـی: " دە بەسـە ئـیتر بێزاربـووم، کـەسمان تۆمـان لێـرەدا ناوێـت. چـەند جـار پێمـان وتـی تۆمـان ناوێـت و ئێـستایش پێـت دەڵـێم، تـۆ بیرۆکـەی سـووك و نابـەجێت لـەبارەی پێکهاتـەو گەوهـەری ئێمـەوە هەیـە. ئەگـەر تۆزقاڵێـك ئـەوەز ئـەو سـەرەتدا هەبوایـە کـە هـەر بەسـەری مریـشك دەچـێت ئـەوا دەتزانـی کـە ئێمـە خـەڵکێکی بێنـامووس نـین. دەی بـا وا دانـێین تـۆ ئێمـە بـەدەرکردن دەدەیـت. گریمـان بـەو کـارە هەڵدەسـتیت. پێـت وایـە دەکەوینـە ڕێویـان و بـەدوای ئیـشێکی نـزم و هیـچوپووچی بیـست و پێـنج سـێنتیی تـری وادا دەگـەڕێین. تـۆ هێـشتا ئـەوەت نەزانیووە کە ئێمـە مـەزرای خۆمـان هەیـە و خـانووی خۆمـان هەیـە و داڵـدەی بـۆ دەبـەین. خـۆ زۆرمـان لێنـەکراوە هـەر ئـالێرەدا بمێنینـەوە. خانوومـان هەیـە.. مریـشکمان هەیـە.. درەختـی میوەمـان هەیـەو ئـەوێ جێگایەکـە سـەدقات لەمـە خۆشـترو دڵ ڕفێـنترە. جگـە لەوە دۆسـت و برادەریـشمان هەیـە، بـەڵێ هـەموو ئەمانـەمان هەیـە.. دەشـێ سـەردەمانێك لـەوە ترسـابین کـە دەربکـرێین، بـەڵام ئێـستا چـیدی ناترسـێین. ئێـستا ئیـدی زەوی خۆمـان هەیە.. هینی ئێمەیە و دەتوانین پەنا بۆ ئەوێ بەرین."
ژنەکـەی کێـرلی پێـی پێکـەنی و گـوتی: " دەی بیرێـسە. زۆرم لـەم بابەتـەی ئێـوە دیتـووە. ئەگـەر لـە دانـی دنیـا بیـست و پێـنج سـێنتتان هەبوایـە، ئێـوەش لـــەوێ دەبـــوون و بـــەو پارەیـــە دوو پێکـــە وســـکیتان دەنۆشـــی و ژێـــر پەرداخەکانیشتان دەلێستەوە. من شارەزای ئێوە هەم."
ڕووخـساری کانـدی تـا دەهـات سـوورتر هەڵدەگـەڕا، بـەڵام بەرلـەوەی کـچەکە قـسەکەی تـەواو بکـات ئـەم دەسـتی بەسـەر ڕکێفـی خۆیـدا گـرت و بـووە سـەرروەری

بارو دۆخەکە و بە هێمنییەکەوە وتی: " دەبوایە بیزانم... بەلام باشتر وایە برۆیت و ئەلقەکەی پەنجەت بسوورێنیتەوە. هیچ شتێکمان نییە بە تۆی بلێین. ئێمە باش دەزانین خاوەنی چین و هیچ بایەخێکیش نادەین تۆ ئەوە بزانیت یاخود نەیزانیت. بۆیە باشتروایە هەر ئێستا برۆیت و دیارنەمێنی، چونکە کێرلی رەنگە حەز بەوە نەکات لەناو تەویلەکەدا ژنەکەی لەگەڵ ئێمەی بەدناوو بێنابرووداا بەدی بکات."

ئینجا یەك یەك تەماشای رووخسارەکانی کردو هەموویان بەرووی ئەودا داخرابوون. بەلام درێژخایەنترین ماوە تەماشای لێنی کرد، هەتا ئەو کاتەی لەشەرمەزاریدا چاوی شۆڕکردەوەو سەری داخست، ئەویش لە پرێکا وتی: " کێ دەموچاوتی ئاوا شین و مۆر کردۆتەوە؟"

لێنیش خەتابارانە نیگای کردو وتی: " کێ.... من؟"

"بەڵێ... تۆ..."

ئینجا لێنی تەماشایەکی کاندی کرد بەڵکو بیێتە فریادرەس، ئەوسا جارێکی تر لە باوەشی خۆی راماو وتی: " دەستی لەنێو مەکینەیەکدا گیربوو."

ژنەکەی کێرلی پێکەنی و وتی: " نیێ.. نیێ... مەکینە. باشە دوایی قسەت لەگەڵدا دەکەم.. من زۆر مەکینەم خۆش دەوێت."

کاندی خۆی هەڵقورتاندە قسەکەوەو وتی: " تۆ هەقت بەسەر ئەو پیاوەوە نەبێ. سەر مەنێرە سەری و دەست لە کاروباری ئەوەوە وەرمەدە. هەرچییەکت وت بۆ جۆرجی دەگێڕمەوە. جۆرج رێگای ئەوەت ناداتی سەر بنێیتە سەر لێنی."

ئینجا پرسی: " جۆرج کێیە؟ ئەو گەنجە بچکۆلانەیەیە کە تۆ لەگەڵیدا هاتی؟"

لێنیش بە خۆشحاڵییەکەوە پێکەنی و وتی: " بەڵێ.. ئەوە.. ئەو پیاوەیە، ئەوە کە رێگای ئەوەم دەدا کەروێشکەکان بەخێو بکەم."

"دە باشە، ئەگەر مرادی تۆ هەر ئەوە بێ، ئەوا من خۆم رەنگە بتوانم جوتێ کەروێشکت بۆ بکرم."

کرووکس لەسەرچەرپایەکەی هەستاو رووارووی بووەوەو زۆر بە هێمنییەوە وتی: " دە بەسیێتی ئیتر.. تۆ هەقی ئەوەت نییە بێیتە ناو ژووری پیاوێکی رەشپێستەوە، هەروەها هەقی ئەوەشت نییە بێیتە ئێرەو تەنگوچەڵەمە و دەردسەری بەرپا بکەیت. هەر ئێستا برۆ دەرەوە، دەی خێرا برۆ دەرەوە. ئەگەر هەر ئێستا نەرۆیت ئەوا بە سەرکار دەڵێم ئیتر هەرگیز رێگا نەدات بێیتە نێو تەویلە کە."

ئەویش نیگای رقرێژی خۆی ئاراستەکردو وتی: " گوێبگرە قولەرەش، دەزانی چیت بەسەر دێنم ئەگەر ئەو دەمە بۆگەنەت بکەیتەوە؟"

کرووکس هیوا براوانە چاوی تێبڕی و ئینجا لەسەر چەرپایەکەیدا دانیشت و بەخۆیدا شکایەوە.

ئەویش لێی هاتە پێشەوەو وتی: " دەزانی چی دەکەم وانییە؟"

کرووکس تا دەهات لەبەردەمیدا بچووکتر دەبووەوەو زیاتر خۆی لە دیوارەکە توند دەکرد: " بەڵێ خانم."

"دەباشە کەوایە جێگاکەت بپارێزە قولەرەش. پێم دەکرێ کارێکی وابکەم زۆر بە ئاسانی بە دارێکەوە هەڵبواسرێیت، کە ئەوەیش شتێکی ئەوەندە خەنداوەرو سەیر نییە."

کرووکسیش خۆی هێندە بچووك کردبووەوە، وەکو ئەوەی لێهاتبوو کە بوونی نەبێت. بێ کەسێتیی بوو، بێ ئیگۆ بوو.. هیچ شتێك حەزکردن و قیزهاتنەوەی ئەوی نەدەبزواند. پاش قەدەرێکی کە مخایەن بە دەنگێکی سست و یەکنەواوە وتی: " بەڵێ خانم دەزانم."

کچەکە بۆ چرکەساتێك هەروا بەسەر سەرییەوە راوەستا وەك بڵێی چاوەڕوانی ئەوە بکات جووڵەیەکی لێوە بێت بۆ ئەوەی دووبارە بکەوێتە وێزەی و سەرکۆتی بکاتەوە، بەڵام کرووکس هیچ جووڵەیەکی لێوە نەهات و چاوەکانیشی بە ئاراستەیەکی تردا رەوانە کردو رووی وەرگێرا بۆ ئەوەی هەموو خاڵە لاوازەکانی جەستەی خۆی لە ئازار بپارێزێ. سەرەنجام رووی کردە دوانەکەی تر.

کاندییە پیر کە بەسەر سوورمانێکەوە تەماشای دەکرد بە هێمنییەکەوە وتی: " ئەگەر بە شتێکی ئاوا هەڵبستیت، ئەوا ئێمەیش دەڵێین.. ئەوا ئێمەیش دەڵێین کە تۆ بوختان بۆ کرووکس دەکەیت ودرۆی بۆ هەڵدەبەستی."

ئەویش بە دەنگی بەرزەوە وتی: " جا بیڵێن و بکەونە ژێر نەفرەتەوە.. کێ گوێتان لێ دەگرێت. خۆشتان ئەوە چاك دەزانن کە کەس باوەڕتان پێناکات."

کاندی هێواشێك ئەوی بووەوەو بە هاوارییەوە وتی: " کەواتە ئاوا... کەس گوێ لە قسەی ئێمە ناگرێت."

ئینجا لێنی بەهاوارەوە وتی: " بریا جۆرج لێرە بوایە... بریا جۆرج لێرە بوایە."

کاندی ئێی نزیکبووەوەو وتی: " تۆ هیچ نیگەران مەبە. هەر ئێستا گوێم لێیان بوو دەهاتنە ژووری. دڵنیام کەجۆرج ئێستا لە خانووی کرێکاراندایە."

ئەمەی وت و ئاوڕی لە ژنەکەی کێرلی دایەوەو بە هێمنییەوە پێی وت." چاکتر وایە بۆ ماڵەکەی خۆت بڕۆیتەوە. ئەگەر هەر ئێستا بڕۆیتەوە ئەوا بە کێرلی ناڵێین کە تۆ لێرە بوویت."

ژنەکە نیگایەکی ساردوسڕ و هەڵسەنگێنەریی ئاراستەکرد و وتی: " من دڵنیام کە گوێت لەهیچ شتێك نەبوو."

کاندیش وتی: " باشتر وایە خۆت نەخەیتە تالووکە و مەترسییەوە. ئەگەر زۆریش دڵنیا نیت، وا چاکە ڕێگا سەلامەتەکە بگریتە بەر."

ئەوسا ئافرەتەکە ئاوڕی لە لێنی دایەوەو پێی وت: " خۆشحاڵم کە ئەختێك کێرلیت تێك شکاند. بێ مێشك و هەڵەشە بوو، پێویستیشی بە شتێکی وا هەبوو. جاروبار من خۆیشم پێم خۆشە تێکی بشکێنم."

پاش وتنی ئەوە لە دەرگاکەوە داخزایە دەرەوەو لەنێو تاریکایی تەویلەکەدا ڕەوییەوە. کاتێك کە بە تەویلەکەدا ڕابوورد، هەوسارە زریزەییەکان کەوتنە زایەڵە دانەوەو هەندێك لە ئەسپەکان کەوتنە پرمەپرم و هەندێکیشیان کەوتنە سم کوتان.

وا دیاربوو کرووکس لەو هەموو چین و توێژەی کە بۆ خۆپاراستن بەخۆیدا دابووی هێدی هێدی هاتە دەرەوە و وتی: " ئەوە ڕاست بوو کە وتت هاوڕێکانمان هاتنەوە؟"

"بێگومان.. گوێم لە دەنگیان بوو."

"بەڵام من گوێم لە هیچ شتێك نەبوو."

کاندیش وتی: " دەروازەکە بە قایی داخرا. ژنەکەی کێرلیش زۆر بە هێمنیی پایدۆزی کرد. لەو باوەڕەدام کە مەشقێکی زۆری بینیبێ."

ئینجا کرووکس سەر لەبەری بابەتەکەی پشت گوێ خست و وتی: " چاکتر وایە ئێوەش بڕۆن. دڵنیانیم ئەوەی کە ئاخۆ حەز دەکەم لێرە بمێننەوە یان نا. دەبێ ڕەشپێستێك هەندێ مافی هەبێت هەتا ئەگەر بێت و حەزیشیان لێ نەکات."

کاندیش گوتی: "ئەو سۆزانییە نەدەبوایە ئەو قسە نا بەجێیانە بە تۆ بڵێت."

کرووکسیش بەکزومەنوونییەکەوە وتی: " گوێی مەدەرێ هیچ نەبوو. کە ئێوە هاتنە ئێرەو لەگەڵما دانیشتن، ئەوەی لەبیری من بردەوە. ئەوەی کە ئەویش وتی هەمووی ڕاستە."

ئەنجا ئەسپەکان لە تەویلەکەدا کەوتنە پرمەپرم و دەنگی زنجیرەکان زرینگەی دایەوەو دەنگێکیش بانگی کرد: " لێنی.. هۆ لێنی.. لە تەویلەکەدایت؟"

لێنیش هاواری کرد: " ئەوە جۆرجە" ئینجا پاکۆی دایەوەو وتی: " بەڵێ جۆرج من ئەوەتام لێرە."

ئەوسا لە چاوتروکانێکدا دەرگاکە جۆرجی لە چوارچێوەدا و ئەویش نیگایەکی نا قایلانەی گرتە ئەو دەوروبەرە و وتی: " تۆ لە ژوورەکەی کرووکس دا چی دەکەیت. تۆ نەدەبوایە لێرە بیت."

کرووکسیش سەری ڕاوەشاندو وتی: " من پێم وتن بەڵام ئەوان هەر هاتنە ژوورەوە."

"ئێ بۆ دەرت نەکردن؟"

کرووکسیش وتی: " ئەوی ڕاستی بێ هێندە گوێم نەدایێ... چونکە لێنی زەلامێکی ڕێکو پێکە."

ئەوسا کاندی خۆی جوولاندەوەو وتی: " نا.. جۆرج. من خەریکی حیسابات کردن بووم. بەتەواوی هەموو شتێکم لێکدایەوەو ئەوەیشم بۆ ڕوونبووەوە کە چۆن چۆنی هەتا لە کەروێشکەکانیش دەتوانین هەندێ پارە قازانج بکەین."

جۆرجیش لێی مۆڕ بووەوەو وتی: " وا بزانم من پێم وتی ئەوە بە هیچ کەسێك نەڵێی."

کاندی هەستی بە داخداریی کردو وتی: " بەکەسم نەوت هەر تەنها بە کرووکس نەبێ."

جۆرجیش وتی: " دە باشە بڕۆنە دەرەوە دەی... ناخ.. وا دیارە بۆ خولەکێکیش ناتوانم لێتان دووربکەومەوە."

کاندی و لێنی هەستانە سەرپێ و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتن. کرووکس هاواری کرد: " کاندی!"

"ها.. چیت دەوێ؟"

"دێتەوە بیرت چیم پێ وتی دەربارەی بژارکردنی باخچەو جێبەجێ کردنی نیشە جۆراو جۆرو ئاسانەکانتان؟"

کاندیش وتی: " بەڵێ.. دێتەوە بیرم."

کرووکسیش وتی: " دە باشە." لەبیری خۆتی بەرەوە. چونکە من بەڕاستم نەبوو. گاڵتەم دەکرد... من نامەوێ بچمە شوێنێکی لەو جۆرەو تیایدا بژیم."

" دەباشە دەی... ئەگەر ئەوە ویستی تۆ بێت، باوابێت. دەی شەوت شاد."

ئەوسا هەر سێ پیاوەکە لە دەرگاکەوە دەرچوون. کە بە تەویلەکەیشدا گوزەریان کرد دیسانەوە ئەسپەکان کەوتنە پرمە پرم کردن و هەوسارە زنجیرییەکانیش کەوتنە زرنگە زرنگ.

کرووکس لەسەر چەرپایەکەی خۆیدا دانیشت و بۆ گاڤۆکمیەك چاوی بڕییە دەرگاکە و پاشان دەستی بۆ شووشە ڕۆنەکە درێژکردو لە پشتەوە پاڵدمی کراسەکەی هێنایە دەرەوەو تۆزقاڵێك ڕۆنی داچۆڕانده نێو لەپە پەمەییەکەی خۆی و ئینجا دەستی بۆ پشتەوە درێژکردو بەهێواشی دەستی بە شێلانی پشتی خۆی کرد.



سووچێکی تەویلە گەورەکە بەکایەکی تازە کەڵەکە کرابوو لەسەر کەڵەکە کایەکەشدا چنگاڵێکی چوار لکی بەخولخلۆکەیەکەوە بە میچەکەوە هەڵواسرابوو. کەڵەکە کایەکە وەکو دامێنی کێوێك هەتا سووچەکەی تری تەویلەکە داشکابووە خوارەوەو لە تەنیشتیشیدا جێگایەکی تەختان هەبوو کە هێشتاکە لەبەروبوومی تازەی کاپڕ نەکرابوو. لەملاولەولاکانیدا نالیکدانەکان دیاربوون و لە نابەینی تیرە شیشەکانیشەوە سەری ئەسپەکان دەبینران.

ئەو ڕۆژە پاش نیوەڕۆی یەکشەممە بوو. ئەسپە وچانگیرەکان خەریکی کرۆژتنی ئەو بەرماوە ناچیزەی کابوون و سمەکانیان دەکوتایە عەرزو خرمە خرمیان لە داری ئاخوڕەکانیانەوە هەڵدەستاندو هەوسارە زنجیرییەکانیان زرە زری دەهات. تیشکی هەتاوی پاش نیوەڕۆش درزو شەقاری نێو دیوارەکانی تەویلەکەی دەبڕی و کۆمەڵێك هێڵی درەوشاوەیان دەخستە سەر کایەکەوە و گیزە گیزی مێشیش لەو دوا نیوەڕۆ خاوخلیچك و پڕ ئەهمە همەدا ئەو ناوەی دەتەنی. لە دەرەوەشدا لە سنگی یاری ناڵ ناڵێنەوە تەقە تەقی ناڵەکان و هەراوزەنای پیاوە یاریکەرەکان و هاندەرەکان و هووهاکێش و گاڵتەکەرەکان دەهاتنە بەرگوێ. بەلام لەناو تەویلەکەدا همە هەم و خاوخلیچکیی و گەرمایەکی بێڕادە بالا دەست بوون.

هەر بەتەنها لێنی لەناو تەویلەکەدا بوو، لەناو کایەکەدا لە تەنیشت سنووقێك لەژێر ئاخوڕێکی ئەولایەی تەویلەکەدا دانیشتبوو کە هێشتا بەکا پڕ

نەکرابووەوە. لەناوکایەکەدا دانیشتبوو چاوی بڕیبووە توتەڵە سەگێکی بچکۆلانەی تۆپیوو کەلە بەردەمیدا ڕاکشابوو. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن تەماشای کردو پاشان دەستە گەورەکەی درێژ کردو پیای دا مالی. لە قەپۆزەوە دەستی پیادا مالی و لەکلکی کۆتایی پێ هێنا.

ئەوسا بە ئەسپایی بە توتەڵەکەی وت: " بۆ دەبوایە بمریت؟ خۆ تۆ بە قەدەر مشك بچووك نیت.. خۆ منیش بە قایمی دەستبازیم لەگەڵدا نەکردی." ئەمەی گوت و سەری توتەڵەکەی هەڵبڕی و لە دەموچاوی ڕاماو پێی وت: " ئێستا ئیتر ڕەنگە جۆرج نەهێڵێت کەروێشکەکان پەروەردە بکەم، بەتایبەتی ئەگەر بزانێت کە تۆ کوژراویت."

ئینجا چاڵێکی بچکۆلانەی هەڵکەندو توتەڵەکەی تیا دانا و بەکا داپۆشی، ئیتر دیارنەما، بەلام ئەو هێشتا هەر چاوی بڕیبووە ئەو تەپۆلکە بچکۆلەیەی کە دروستی کردبوو.. ئینجا بەخۆی وت: " ئەمە شتێکی زۆر خراپ نییە هەتا بڕۆم و خۆم لەناو بێشەلانەکەدا حەشار بدەم.. نا.. نا! ئەمە گوناهێکی گەورە نییە. بە جۆرجیش دەڵێم بە مردوویی دیتمەوە."

ئەوسا توتەڵەکەی دەرکردو بە وردی بەسەری کردەوە.. ئینجا لە گوێیەکانییەوە هەتا کلکی دەستی پیا هێناو بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە لەسەر قسە بەردەوام بوو وتی: "هەرچی چۆنێك بێت پێی دەزانێت، جۆرج هەمیشە پەی بەشتەکان دەبات.. و ئەوسا پێم دەڵێت: " ئەوە کردەوەی تۆیە.. و هیچ هەولێش مەدە هەڵم بخەڵەتێنی.".. ئینجا پێم دەڵێت: " تۆ ئاوایت.. لەبەر ئەوە تۆ ناتوانیت کەروێشکەکان پەروەردە بکەیت!"

لە پڕێکا ڕق و قینی بەرزبووەوەو بەهاوارەوە وتی: " بەلەعنەتی خوا بیت.. بۆ دەبوایە بمریت؟ خۆ تۆ بەقەدەر مشك بچووك نیت." ئینجا توتکە سەگەکەی هەڵگرت و تووڕی هاویشت. ئەوسا پشتی تێکرد، دانیشت و بەسەر ئەژنۆ هەڵبڕاوەکانیدا چەمایەوە و بەسرتە سرتەوە وتی: " ئێستا ئیتر

مــن کەروێــشکەکان بەخێوناکــەم. ئێــستا ئــیتر جــۆرج ناهێڵێــت کەروێــشکەکان بەخێو بکەم." ئینجا لە خەم و خەفەتا پێش.و پاش کەوتە خۆ ڕاژەنین.

لـە دەرەوەشـدا دەنگـی تەقـەی ناڵێـك هاتـە بـەرگوێ کـە بـەر سـنگی ئاسـنین کـەوت و پـاش ئـەوەیش دەنـگ و هەڵاڵـیـەکی بـچکۆلە بـەرز بـووەوە. لێنـی هەسـتاو توتەڵەکـەی هێنایــەوە و لەســەر کایەکــە داینــاو دانیــشت. دووبــارە دەســتی بــە ئــەوازش کردنــی توتەڵەکــە کــردەوەو پێــی وت: " هێــشتا چــاك گــەورە نــەبوویت.. هــەر پێیــان وتم و پێیــان وتم کــە تــۆ هێــشتا چــاك گــەورە نەبوویتــە، بــەلام نەمــدەزانی ئــاوا بــە ئاســانی دەمریــت." ئینجــا پەنجــەکانی لەســەر گوێــچکەی پــەژموورد‌ەی توتەڵەکــەدا خــستە کــارو وتــی: " ڕەنگــە جـۆرج کەمتەرخــەمیی بکــات و گــوێ نــەدات. خــۆ ئــەم توتەڵــە ســەگبابە بچکۆلەیە هیچ بایەخێکی بۆ جۆرج نییە."

پـاش قـەدەرێك ژنەکـەی کێـرلی لـە دوا سووچـی تەویلەکـەوە بەدیارکـەوت. هێنـدە بـە هێمنییــەوە هاتــە ژووری، لێنــی تێبینــی نــەکرد. کراســە کەتانییــە ئاڵوواڵاکــەی لەبەرکردبوو، ئەو سۆڵەشـی لـە پێدابوو کـە بـە پـەڕی وشـترمرخ ڕازابـووەوە، دەموچـاوی بـە مــەکیاج ســواخ درابــوو، پرچیــشی وەك هەمیــشە بــە شــێوەی لــوول لــوولی بــچکۆلانە شۆڕببووەوە. بەر لەوەیش کە لێنی چاوی هەڵبێنێ و ببینێ لە تەنیشتیدا وەستابوو.

ئــەویش لــە شــپرزەییدا بــە پەلــە پــەل کــای بەســەر توتەڵەکــەدا داو بــە مــرج و مۆنییەکەوە تەماشای کرد.

کچەکە وتی: " چی لەوێ هەیە نازیزم؟"

لێنــیش نیگایــەکی تونــدو تیژانــەی کــردو وتــی: " جــۆرج پێــی وتم هــیچ هــەقم بەسەر تۆوە نەبێ.. نە قسەت لەگەڵدا بکەم و نە هیچ شتێك.."

کــچەکە پێکــەنی و وتــی: " کەواتــە جــۆرج لــە بــارەی هــەموو شــتێکەوە فرمانت پێدەدات؟ "

لێنــی چــاوی شــۆڕ کــردەوە و کەوتــە تەماشــاکردنی کایەکــە و وتــی: " وتــی ئەگــەر قسەت لەگەڵدا بکەم یاخود هەر شتێکی تر ئەوا ناهێڵێت کەروێشك بەخێو بکەم."

کچەکەیش بەدەنگێکی نەوی و کزەوە وتی: " ئەمە لەوە دەترسێ کە کێرلی ڕقی هەستێ و تووڕە بێت.. بەڵام ئێستا کێرلی دەستە تیمارکراوەکەی بەملیدا هەڵواسراوە و ئەگەر بکەوێتە شەڕفرۆشتن ئەوا دەتوانی دەستەکەی تریشی تێك بشکێنی. خۆ من بەوە هەڵەخەڵەتام کە وتتان دەستی لەناو مەکینەیەکدا گیربوو."

بەڵام لێنی بەبێنەوەی لێی نزیك بکەوێتەوە وتی: " نا... نا... خاتوون. من نامەوێ لەگەڵتدا بدوێم و هەقم بەسەرتەوە هەبێ."

ئینجا لەناو کایەکەدا لە تەنیشت لێنی لەسەر چۆك دانیشت و وتی: " گوێبگرە.. هەموو پیاوەکان بەیاری ناڵ ناڵێنەوە مژۆڵن و هێشتایش سەعات چوارە. هیچ یەکێکیان دەستبەرداری ئەو یارییە نابێت. ئەی ئیتر بۆچی نەتوانم قسەت لەگەڵدا بکەم؟ هیچ کەسێك نییە قسەی لەگەڵدا بکەم و هەستیش بەتەنیاییەکی ئێجگار گەورە دەکەم."

ئینجا لێنی وتی: " ئێ چیبکەم، نابێ قسەت لەگەڵدا بکەم و هەقم بەسەرتەوە هەبێت."

ئەویش وتی: " هەست بە تەنیایی دەکەم. تۆ دەتوانی لەگەڵ ئەوانی تردا بدوێیت، بەڵام من جگە لە کێرلی ناتوانم لەگەڵ کەسی تردا قسە بکەم، ئەگینا شێت و هار دەبێت. ئەی تۆ خۆت چەندت پێ خۆش دەبێ ئەگەر لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەتوانی قسە بکەیت؟"

لێنیش وتی: " چار چییە، نابێ لەگەڵتدا قسە بکەم، چونکە جۆرج دەترسێ بەڵایەکم بە سەردا بێت."

ئینجا ژنەکە بابەتەکەی گۆڕی و وتی: " ئەوە چیت لەوێدا شاردۆتەوە؟"

لێنیش لە پڕێکا مەینەتی و کرفتارییەکەی بەبیردا هاتەوەو بە خەمبارییەکەوە وتی: " توتەڵە سەگەکەمە.. توتەڵە سەگە بچکۆلەکەم.."

ئەمەی وت و کایەکەی لەسەریدا لابرد.

کچەکەیش هاواری لێ هەستا: " ئۆی.. مردووە."

لێنیش وتی: " زۆر بچووك بوو، یاریم لەگەڵدا دەکرد.. خۆی وا لێدەکرد وەکو ئەوەی گازم لێبگرێ.. منیش خۆمم والێدەکرد وەکو ئەوەی چەپۆکی پیادا بکێشم... و.. لە ئاوام لێکرد و ئیتر مرد."

کچەکە دڵی دایەوەو وتی: " هیچ خەفەت مەخۆ.. توولە سەگێك بوو نە بوو.. دەتوانی بە ئاسانی یەکێکی تر پەیدا بکەیت. ئاوچەکە پڕە لە توولە سەگ."

لێنیش بە دەنگێکی مەینەتبارانەوە وتی: " نەك بەو شێوەیەیش زۆر.. بەڵام جۆرج ئیتر ناهێڵێت کەروێشك پەروەردە بکەم."

"لێ بۆچی ناهێڵێت؟"

"چونکە پێی وتم ئەگەر دووبارە شتی خراپ بکەمەوە ئەوا ناهێڵێت من کەروێشکەکان بەخێو بکەم."

ئەوسا کچەکە زیاتر لێی چووە پێشێ و بە زمانی نووسییەکەوە وتی: " مەترسە ئەوەی کە لەگەڵ مندا قسە دەکەیت. گوێبگرە پیاوەکان چ هاتوهاوارێکیانە لە دەرەوە. ئەو یارییەدا گرەویان لەسەرچوار دۆلار کردووە. هیچ کەسێکیشیان دەستبەرداری ئەوێ نابێ هەتا یارییەکە تەواو نەبێ."

لێنی بە پارێزەوە وتی: " ئەگەر جۆرج ببینێ لەگەڵ تۆدا دەدوێم ئەوا سەر زەنشتێکی توندو تیژم دەکات. خۆی ئەوەی پێ وتم."

تووڕەیی دەموچاوی کچەکەی داگرتەوەو بە هاوارەوە وتی: " ئەی باشە من چیمە؟ ئەی من مافی ئەوەم نییە لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسە بکەم؟ بۆ ئێوە من بە چی دەزانن؟ تۆ کەسێکی باش و ڕێکوپێکی و... ئیتر نازانم بۆچی نابێ لەگەڵتدا قسە بکەم.. خۆ زەرەرو زیانێکم لەتۆ نەداوە؟"

"لێ جۆرج دەڵێ تووشی بەڵامان دەکەیت."

ئەویش وتی: " ئای کە بێ ئەقڵن! باشە من چ زەرەرێك بە تۆ دەگەیەنم؟ بەوە دەچێ هیچ کەسێکیان گوێ بەوە نەدەن کە من چۆن دەژیم. دەبا پێت بڵێم من ڕانەهاتووم بەم شێوەیە بژیم. دەمتوانی ببمە ئافرەتێکی بەناوبانگ و ناسراوە."

ئەوەی بە دەنگێکی خەمبار وت و درێژەی دایێ: " ڕەنگە هێشتایش بواری ئەوە‌ هەبێ." ئەوسا وشەکانی بەجۆش و ئارەزوویەکی بەتینی وتووێژکردنەوە دەرپەڕینە دەرەوە، وەکو بڵێیت پەلە پەلی ئەوەی بێت نەبادە گوێگرەکەی لێ قۆرغ بکەن: " لە سالیناس دەژیام.. هەر کە منداڵ بووم بۆ ئەوێ چووین. ڕۆژێك تیپێکی نواندن بۆ ئەوێ هات و یەکێك لە ئەکتەرەکانم ناسی و پێی وتم دەتوانم لەگەڵ تیپەکەیاندا بڕۆم، بەلاّم دایکم نەیهێشت، وتی لەبەر ئەوەی من هێشتا پانزە ساڵم. وەلێ پیاوەکە وتی دەتوانم لەگەڵیاندا بڕۆم. ئەگەر لەگەڵیان بڕۆیشتمایە. دڵنیابە ئێستا ئاوا نەدەژیام."

لێنیش لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر توتەڵەکەی ئەوازش دەکردو بەهێمنییەوە وتی: " مەزرایەکی بچکۆلانەو.. کۆمەڵێك کەروێشکمان دەبێت."

ئەویش بە پەلەپرووزێ کەوتە گێڕانەوەی سەربووردەکەی خۆی نەبادە قسەبڕ بکرێت: " جارێکیش پیاوێکم ناسی ئەکتەرێکی بەشۆرەتی سینەمایی بوو. لەگەڵیدا بۆ ڕیڤەرسایید دانس پالاّس ڕۆیشتم. پێی وتم دەمکاتە ئەکتەرێکی سینەمایی و دەمخاتە نێو فلیمەوەو وتی من هەر بە خۆرسك ئەکتەرم و وتیشی هەر کە چووەوە بۆ هۆڵیوود ئەوا لەو بارەیەوە نامەم بۆ ڕەوانە دەکات." کچەکە، ئەوسا بۆ ئەوەی بزانێت کە ئاخۆ کاری تێکردووە یان نا، بەدیقەت و وردییەکی زیاترەوە تەماشای لێنی کردو وتی: " بەلاّم من ئەو نامەیەم هەرگیز پێنەگەیشت و هەمیشەیش پێم وابوو کە دایکم لێی دزیووە. ئیّ خۆ نەمدەتوانی لە شوێنێکدا بمێنمەوە کە سوور دەمزانی نامەکانم تیایدا دەدزرێت و هیچ بە هیچ ناکەم و ناوبانگیشم نابێت. هەروەها ئەوەشم لە دایکم پرسی کە ئایا نامەکەی دزیووە، بەلاّم دایکم وتی نا نەمدزیووە. بۆیە منیش شووم بە کێرلی کرد. هەر هەمان ئەو شەوەی کە کێرلیم لە ڕیڤەرسایید دانس پالاّس دا ناسی "

ئینجا لە لێنی پرسی: " ئەرێ گوێت لێمە؟"

"کێ.. من ؟ بێگومان گوێم لێتە.."

"هەتا ئێستا ئەمەم بە هیچ کەسێك نەوتووە. ڕەنگە نەیشدەبوایە هەرگیز بیدرکێنم. من کێرلیم خۆش ناوێت، پیاوێکی ماقووڵ نییە." ئینجا لەبەرئەوەی کە

دەردە دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتبوو، زیاتر لێی نزیك کەوتەوەو لە تەنیشتیدا دانیشت و وتی: " دەمتوانی ببمە تەستێرەیەکی سینەمایی و جلو بەرگی جوان و نایابم هەبێت.. وەکو ئەو جلوبەرگە نایابانەی کە ئەوان لەبەری دەکەن و.. لەو ئوتێلە ناوازانەیشدا بژیم کە ئەوان تیای دادەبەزن و بەردەوامیش وێنەم بگیرێت. کاتێکیش کە یەکەمین پیشاندانی فیلمەکانم دەکرا ئەوا دەمتوانی بڕۆم و لە ئێزگەی ڕادیۆوە قسە بکەم، تەنانەت سێنتێکیش نەسەرم نەدەکەوت چونکە من پاڵەوانی فیلمەکە بووم. بەو هەموو جلوبەرگە جوانانەوە کرۆشەم دەکرد کە ئەوان لەبەری دەکەن. چونکە ئەو پیاوە پێی وتم کە من هەر بە خۆڕسك ئەکتەرم." ئینجا چاوێکی بە لێنی دا هەڵبڕی و بۆ ئەوەیش کە دەریبخات دەتوانێ ڕۆڵی سینەمایی ببینێت ئیشارەتێکی دانسقەی بچووکی بە دەست و قۆڵی خۆی کرد. پەنجەکانی بە دوای مەچەکە ڕێنووێنی کەرەکەیدا سووڕانەوەو پەنجە توتەی لەمابەینی پەنجەکانی دیکەیەوە زۆر نایابانە دەرپەڕییە دەرەوە.

لێنی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. لە دەرەوە تەقەتەقی نالی لە سنگ کەوتوو دەهاتە بەر گوێ و دواتریش قیژەو هەراهەرای هاندەرانە بلندبووەوە. ئەوسا ژنەکەی کێرلی وتی: " ڕەنگە یەکێکیان نالەکەی بە سنگەکەوە کردبێ."

ئێستاکە ئیدی بە شۆڕبوونەوەو دانگەڕێزە کردنی هەتاو ڕووناکییەکە هێدی هێدی بەرزبووەوەو تیشکی ڕۆژیش بە دیوارەکەدا هەڵشاخاو بەسەر ئاخوڕەکان و سەرسەری ئەسپەکانەوە گیرسایەوە.

ئەوسا لێنی وتی: " ڕەنگە ئەگەر ئەم تووتکە بەرمە دەرەوەو فڕێی بدەمە شوێنێکی دوور باشتر بێت و جۆرجیش هەرگیز پێی نەزانێت. ئەوسایش دەتوانم بەبێ گیروگاز کەروێشکەکان بەخێو بکەم."

ژنەکەی کێرلیش بە تووڕەییەوە وتی: " تۆ بیر لە هیچ ناکەیتەوە کەروێشك نەبێت؟" لێنیش بەدانبەخۆدا گرییەکەوە وتی: " مەزرایەکی بچکۆلانەمان دەبێت.. خانوویەك و باخچەیەك و پەڵە زەوییەکیشمان دەبێت بۆ چاندنی وێنجەو

ئـەو وێنجەیـەیش تایبـەت دەبـێ بـە کەروێـشکەکانمان، ئینجـا تووڕەکەیـەك دەبـەم و لێواولێوی دەکەم و لە وێنجەو بۆ کەروێشکەکانی دەبەم."

ئەوسـا ئافرەتەکـە لێـی پرسـی: " چـی واتلێـدەکات ئەمەنـدە شـێت و شـەیدای کەروێـشك بیـت؟" لێنـیش بەرلـەوەی بگاتـە بڕیارێـك دەبـوو زۆر بـە وردی بیربکاتـەوە. پـاش دەمێـك بـە پـارێزێکی زۆرەوە لـە کـچەکە نزیـك بـووەوە هـەتا چـووە پـاڵی و وتـی: " مـن شـەیدای گـرتن و نـەوازش کردنـی شـتی جـوانم. کـەرەتێك لـە بازاڕێکـدا هەنـدێك لـەو کەروێـشکە کـورك درێژانـەم بینـی. بـاوەڕ بکـە زۆر جـوان بـوون.. هەنـدێجار هـەتا مشکیـشم نـەوازش کـردووە، بـەڵام ئـەوە کاتێك بووە کە شتێکی باش ترم دەست نەکەوتبێ."

ئینجـا ژنەکـەی کێـرلی نـەختێك لێـێ دوورکەوتـەوەو وتـی: " پـێم وابـێ تـۆ شـێتی.." لێنیش بـە جەختـەوە وتـی: " نـا.. مـن شـێت نـیم. جـۆرج دەڵـێ مـن شـێت نیم.. هەر حەزدەکەم شتی جوان و نەرمونۆڵ بە پەنجەکانم نەوازش بکەم."

ئەوسـا ئافرەتەکـە نـەختێك دڵنیـاو ئـارام بـووەوە و وتـی: " ئـێ کـێ حـەز ناکـات؟ هـەموو کەسـێك حـەز لـەوە دەکـات. منـیش حـەز دەکـەم دەسـت بـە ئاوریشم و مەخمەڵدا بهێنم. ئەی تۆ حەزدەکەیت دەست بە مەخمەڵدا بهێنی؟"

لێنـیش بـە خۆشـحاڵییەوە کەوتـە قریـوە قریـوو و بەخۆشـییەوە هـاواری کـردو وتـی: " بێگومـان، حـەزم لێیـە. پارچەیەکیـشم هـەبوو ژنێـك دای پـێم، ئـەو ژنـەیش پـوورە کلاراکـەی خـۆم بـوو. ئـەو دای پـێم.. پارچـەیەکی نـا ئەمەنـدە دەبـوو. خۆزگـە نـا ئێـستا ئـەو پارچـە مەخمەڵـەم پـێ بوایـە." ئەمـەی وت و گـرژو مۆنبیـیەك دەموچـاوی داگرتـەوە و بـە ئەفـسووسێکەوە وتـی: "بـزرم کردو..ماوەیەکی دوورو درێژیشە نەمبینیوە.."

ژنەکـەی کێـرلی مـەزاقی پێکـردو وتـی: " بـەخوا تـۆ شـێتی. بـەڵام پیـاوێکی ناسـك و ڕێکـوپێکی. هـەر رێـك وەك منـداڵێکی گـەورە وایـت. وەلێ مـرۆ دەتـوانێ لـە مەبەسـتت تـێ بگـات. ئـەو کاتانـەیش کـە پرچـی خـۆم شـانە دەکـەم

دادەنیشم و دەستی پیادا دەهێنم، چونکە زۆر نەرمونۆڵە." ئینجا بۆ ئەوەی پیشانیشی بدات کە چۆنی ئەنجام دەدات. پەنجەکانی لە تەوقی سەرییەوە خستە نێو پرچییەوە و پیایدا هێنان و بە بێباکییەکەوە وتی: " هەندێ خەڵك پرچییان درو زبرە. بۆ نموونە کێرلی بگرە، قژی رێك بەتەل دەچێت. بەلاّم پرچی من ناسك و نەرمو نیانە. بێگومان زۆر زۆر شانەی دەکەم و ئەوەش نەرمونیانی دەکات. ها.. دەست لێرە بدە." دەستی لێنی گرت، و خستییە سەرسەری خۆی و وتی: " رێك دەست لەوێ بدەو بزانە چەند نەرمونۆڵە."

پەنجە درشت و گەورەکانی لێنیش کەوتنە نەوازش کردنی پرچی.

ئافرەتەکە پێی وت: " بەلاّم پرچم تێك نەدەیت."

لێنیش وتی: " ئای.. کە شتێکی خۆشە." ئینجا توندتر دەستی بەپرچیا هێناو دووبارە وتی: " ئای.. کە شتێکی خۆش و نایابە."

پاشان ئافرەتەکە بە توورەییەوە هاواری کردو وتی: " دە بەسە ئیتر نێیگەرێ، پرچم تێك دەدەیت."

ئەوسا کچەکە سەری بەملاو بەولادا راوەشاندو لێنیش بە توندی پەنجەکانی لە پرچی گیرکرد و دەستی لێ بەرنەدا.

ئافرەتەکە هاواری کرد: " بەری دە.. دەڵێم بەری دە!"

ئەوسا لێنی پەشۆکاو رووخساریشی تێکچوو. ئافرەتەکە کەوتە فیزاح کردنی و لێنیش دەستەکەی تری لەسەر دەمولوتیدا توند کردو تکاکارانە وتی: " توخوا قیژە قیژ مەکە.. نۆ.. تکایە هاوار مەکە.. ئەگەر جۆرج ببیستێ شێت و هاوار دەبێت."

ئینجا ئافرەتەکە زۆر بە توند و تیژییەوە لەژێر دەستیدا پەلەقاژێی دەکرد. پەیتا پەیتا قاچەکانی بە کایەکەدا دەکێشاو پەلەفرتێی دەکردو تەقەلای دەربازبوونی دەداو لە ژێر دەستی لێنیشەوە قیژە قیژی تاساو دەهاتە بەرگوێ. ئینجا لێنی زراوچووانە دەستی بەهاوارکردو بە پارانەوەوە وتی: " نۆ... توخوا وا مەکە.. ئەگینا جۆرج پێم دەڵێت شتێکی خراپم کردووەو ئیتر ناهێڵێت کەروێشکەکان بەخێو بکەم."

ئینجا کە نەختێك دەستی لابردو قیژ؛ گڕو نووساوەکەی دەرهاتەوە، ئەوسا لێنی رقی هەڵساو بە تووڕەییەوە وتی: " دە بەسە ئیتر وا مەکە... نامەوێ بقیژێنی.. تووشی دەردو بەڵام دەکەیت هەروەکو چۆن جۆرج وتی ئاوا.. دە بەسە ئیتر وا مەکە.."

ئافرەتەکەیش هەر لنگەفرتێی دەکردو لە سامناکیدا چاوەکانی زەق هەڵگەڕابوون. ئەویش ڕایتەکاندو زۆر بە پەستییەوە وتی: " قیژە قیژ مەکە ئیتر بیبڕەوە."

ئەمەی وت و دووبارە ڕایتەکاندەوە و جەستەی وەکو ماسییەك تەپپەی هات و هێندەی پێنەچوو بێگیان کەوتە سەرعەرزەکە، چونکە لێنی ملی شکاندبوو.

ئیتر تەماشایەکی ژنەکەی کردو بە ناگاییەکی بێڕادەوە دەستی لەسەر زاری لابردو ئەویش بە دامرکاوی و کپ لەوێدا کەوت.

پاشان لێنی وتی: " من نامەوێ عەزیەتت بدەم، بەڵام ئەگەر هەر هاوار بکەیت ئەوا جۆرج شێت و هار دەبێت." کاتێکیش کە بەرسڤی نەدایەوەو نەبزوا ئیتر تەواو بەسەریدا چەمایەوە، دەستی هەڵگرت و بەریدا تا بکەوێت. ئەوسا بۆ چرکە ساتێك واقی وڕماو لە ترسا بە چپەدووەوە وتی: " شتێکی خراپم کرد.. دووبارە شتێکی خراپم کرد.."

ئیتر بە چنگ کەوتە وێزەی کایەکە و بەشێکی لەشی ئافرەتەکەی داپۆشی. لەدەرەوەی تەویلەکەیشدا دەنگ و هاتوهاواری پیاوەکان و تەقە تەقی دوو دانە نالێش کە بەر سنگە ئاسنینەکە کەوتن هاتنە بەرگوێ. ئەوسا لێنی بۆ یەکەمین جار هەستی بە بوونی دەرەوە کردو لەنێو کایەکەدا خۆی مات و گرمۆڵە کردو گوێی هەڵخست و وتی: " شتێکی زۆر خراپم کرد، نەدەبوایە بیکەم. ئیتر جۆرج زۆر پەست دەبێت.. جۆرج پێی وتم.. وتی لەناو بێشەڵانەکەدا خۆم حەشار بدەم هەتاکو دێت.. ئا.. ئەوەی وت." ئینجا لێنی گەڕایەوە و جارێکی تر تەماشای ئافرەتە مردووەکەی کردەوە. توتەڵە سەگە

مردووەکـەیش لـە تەنیـشت ژنەکـەدا کـەوتبوو. لێنـی توتەڵـە سـەگەکەی هـەڵگرت و وتـی: " ئەمـە توورهەڵـدەدەم، چـونکە ئەمـەیش هـەر شـتێکی خراپـە." ئینجـا توتەڵەکـەی خـستە ژێـر پاڵتۆکـەی و لەسـەرخۆ بـە جنگـە کـرێ و خشکانەوە هـەتا دیـواری تەویلەکــە رۆیــشت و لــەمیانی قەڵــشەکانەوە تەماشــای یــاری و قـەرەباڵغیی نـاڵ ناڵێنەکـەی دەرەوەی کـرد. پاشـان لەسـەرخۆ بـە زێـواری لایـەکی دوا ئاخوڕدا خشکایە دەرەوە و دیارنەما.

لــەو کاتــەدا رۆشــنایی هــەتاو گەیــشتبووە ســەری ســەرەوەی دیوارەکــەو روونـاکی نـاو تەویلەکـەیش خـەریکبوو کـزو بێهێـز هەڵدەگـەڕاو ژنەکـەی کێـرلیش بەسەر پشتیدا ڕاکشابوو نیوەی جەستەشی کا دایدەپۆشیی.

بێدەنگییــەکی بێتــانوپۆ بەســەر تەویلەکــەدا بــاڵا دەســت بــوو، خامۆشــیی دوا نیوەڕۆیـەکی دەنگیش مەزراکـەی داگرتبـووەوە. تەنانـەت تەقـە تـەقی ناڵـە هەڵـدراوەکان و دەنـگ و سـەدای یاریکـەرەکانیش بـەرە بـەرە کـزو خامۆشتر ببوونـەوە. لەگـەڵ ئەوەیـشدا کـە دەرەوە هێـشتا هـەر رۆژبـوو، بـەڵام نـاو تەویلەکـە پێشوەخت بـەرەو تـاریکبوون ملـی دەنـا. کۆترێـك لـە دەرگـای کـراوەی وەژوور خـستنی کـاوە هاتـە ژوورەوە و سـوورێکی لـەناو تەویلەکـەدا داو دیـسان چـووەوە دەرێ. لـە دەوروبـەری دواخانـەی تەویلەکـەوە سـەگێکی گەلـە بەدیارکـەوت، ڕیوەڵەیـەکی درێژکۆڵـە بـوو، گوانـە قـورس هەلگـەڕاوەکانی شـۆڕ ببوونەوە. ئینجـا کـە ئـەو سـنووقە نزیـك بـووەوە کـە توتەڵـەکانی تیـا بـوو بـۆنی جەسـتەی مردووی ژنەکـەی کێـرلی بـە لۆزیـدا هـات و مووەکـانی سەرپشتی ڕەپ هەڵگـەڕان. پاشـان نــووزە نــووزێکی کــردو بــەرەو لای ســنووقەکە کــشاو بــازی دایــە نــاوەوەو لــەمیان توتکەکانیـدا نـۆقرەگیر بـوو. ژنەکـەی کێـرلی بێگیـان ڕاکـشابوو نیـوەی جەستەشـی بـەکای زەردیلـە داپۆشـرابوو. هـەر هـەموو بەدفـەڕیی و پیلانگێڕیـی و بەگلەوگازانـدەیی و ئـازار چەشـتن بـۆ ڕاکێـشانی سـەرنجی خـەڵکیی چـیدی لەسـەر رووخـساریدا دیارنـەمابوون. دەموچاویـشی زۆر جـوان و ســادەو ســاکارو ئێـسك سـووك و تـەڕوبڕو جحێـڵ دیـاربوو. ئێـستاکە ئـیتر گۆنـا مـەکیاج کراوەکـانی و لێـوە سـووراو دارەکـانی وایـان بەدیاردەخـست

کە هێشتا هەر زیندووەو لە خەوێکی خۆشدایە. لوولییەکانی پرچیشی، کە هەر بە وردە سۆسجی بچکۆلانە دەچوون، لە پشتی سەرییەوە بەسەرکایەکەدا پەرت و بلاوببوونەوەو زاریشی نەختێك لێك ترازا بوو.

هەروەکو چۆن هەندێجار روودەدات، ناوا، چرکەساتێك باری خست و بۆماوەیەکی زۆر زیاتر لەو چرکە ساتە نەنگەری گرت و مایەوە. دەنگ و جوولەیش بۆماوەیەکی زۆر زۆر زیاتر لەو چرکەساتە بێدەنگبوون و راوەستان. ئەوسا هێدی هێدی دیسانەوە وەخت هاتەوە سەرخۆی و تەوەزەلانە کەوتەوە جوولە جوول. لە لایەکەی تری ئالیکدانەکاندا ئەسپەکان سمەکانیان دەکوتایە زەوی و قەمتەرە زنجیرییەکانیش زرە زریان لێوە دەهات. لە دەرەوەیشدا جاروجەنجالی پیاوەکان بلندتر بووەوە و روونتر بیسترا. لە زێواری دوا خانەی تەویلەکەوە دەنگی کاندییە پیر بەرز بووەوەو بانگی کرد: " لینی ! هۆ لینی ! لینی ئەوە لێرەیت؟ هەندێ حیساباتی ترم ئەنجامداوە. دەبا پێت بلێم چیمان پێ دەکرێ لینی.."

ئەوسا کاندییە پیر لە پەنای دوا خانەی تەویلەکەوە دەرکەوت و دیسان بانگی کردەوە: " لینی.. هۆ لینی!" ئیتر هەلوەستەیەکی کردو رەق و وشك هەلگەرا. بە کۆتەرەی مەچەکە لووسەکەی ریشە سپییە زبرەکەی خوراندو بەژنەکەی کێرلی وت: " نەم زانی تۆ لێرەیت."

کاتێکیش کە ئەو وەلامی نەدایەوە، لێی نزیکتر کەوتەوە و بەناقایلییەکەوە وتی: " شتێکی باش نییە ئالێرەدا بخەویت.." ئینجا کە گەیشتە تەنیشتی وتی: " ئەی هاوار خودایە!" و بە دۆشداماوییەوە تەماشای دەوروبەری کردو ریشی خوراند. پاشان هەلبەزییەوە و بەلەز لە تەویلەکە چووە دەرێ.

بەلام تەویلەکە جۆش و خرۆشی تێکەرابوو. ئەسپەکانیش سمیان بە زەویدا دەکێشا و پرمە ولووشە لووشیان دەهات و کەوتبوونە کرۆژتنی پووش و پەلاشەکەی ژێریان و زنجیری قەمتەرەکانیان بەریەك دەکەوتن و زرەیان لێوە هەلدەستا. پاش ساتەوەختێك کاندی هاتەوە و جۆرجیشی لەگەلدا بوو.

جۆرج وتی: " لەبەرچی دەتویست من ببینی؟"
کانـدیش ئیـشارەتی بـۆ ژنەکـەی کیـرلی کـرد. جـۆرجیش تیـی ڕامـاو پرسـی: " ئەوە چییەتی ؟ چی لیّ هاتووە؟"
ئینجـا لـە ئاقرەتەکـە نـزیکتر کەوتـەوە و گوزارشـتەکەی کانـدی دووپـات کـردەوە: " ئـەی هـاوار خودایـە!" ئـەوەی وت و لەتەنیـشتیدا کەوتـە سەرچـۆك و دەسـتی خـستە سـەر دڵـی. سـەرەنجام کـە زۆر بـە سـەنگینی و کـاوەخۆ هەسـتا، دەموچـاوی هەروەکو تەختەدار ڕەق و وشك هەڵگەڕا بوو چاوەکانیشی زەق زەق ببوون.
کاندی وتی: " دەبیّ کیّ ئەمەی کردبیّ؟"
جـۆرجیش بـە کەمتەرخەمییەکـەوە سـەیری کـردو لیّـی پرسـی: " هـیچ بۆچـوونێکت نییـە؟" کانـدیش کـشومات بـوو. ئەوسـا جـۆرج نائومێدانـە وتـی: " دەبوایە مەزەندەی ئەمە بکەم، ئەو باوەڕەدام کە لە هزری خۆمدا زانیبێتم."
کاندیش وتی: " ئەی ئێستا چیبکەین جۆرج؟ ها.. چیبکەین؟"
جـۆرجیش ماوەیـەکی دووروودرێـژ بـەوەوە سـەرقاڵ بـوو کەچـی وەڵام بداتـەوە. ئینجـا وتـی: " پـێم وایـە.. دەبـیّ بـەوانی تـریش.. بڵـێین. پـێم وایـە دەبـیّ بیگـرین و بەنـدی بکـەین. نـابیّ بهـێڵین بەسـەریا بـچیّ و دەربـازبیّ. ئـەم گەمـژەو کلۆڵـە سـەگبابە هـەر لـە برسـا دەمرێـت." ئینجـا هـەوڵی ئـەوەی دا دڵـی خـۆی بداتـەوەو وتی: " ڕەنگە بەندی بکەن و بەجوانی ڕەفتاری لەگەڵدا بکەن."
بـەڵام کانـدی بەورووژانێکـەوە وتـی: " بالێیگـەڕێن دەربازبێـت.. تـۆ هێـشتا ئـەو کێرلییە ناناسیت. کێرلی خۆی هەڵیدەواسێت.. خۆی بە کوشتی دەدات.."
جـۆرج چـاوی بڕییـە لێوەکـانی کانـدی و سـەرەنجام وتـی: " بـەڵێ.. ڕاسـت دەکـەیت.. کێـرلی هـەوڵی کوشـتنی دەدات.. ئـەوە دەکـات و پیاوەکـانیش هـەروەها ئـەومیان لێدەوەشێنەوە و.. دەیکەن.." ئەوەی وت و ئاوڕی دایەوەو تەماشای ژنەکەی کێرلی کرد.
پـاش ئـەوە کانـدی گـەورەترین تـرس و پـەروای خـۆی دەربـڕی و وتـی: " خـۆ مـن و تـۆ هـەر خۆمـان دەتـوانین ئـەو مـەزرا بـچکۆلەیە بکـڕین جـۆرج، نـاتوانین؟

مــن و تــۆ دەتــوانین بــچینە ئــەوێ و خــۆش بــژین جــۆرج، نــاتوانین ؟ جــۆرج، ناتوانین؟"

بەرلــەوەی جــۆرج وەڵاَم بداتــەوە، کانــدی ســەری شــۆڕکردەوەو لــە کایەکــە وردبووەوە. چونکە وەڵامەکەی دەزانی.

ئینجـا جـۆرج بـە هێمنییەکـەوە وتـی: " پـێم وابـێ هـەر لەسـەرەتاوە دەمزانـی. پـێم وابـێ دەمزانـی کـە هـەرگیز نابینـە خـاوەنی ئـەو مەزرایـە. تەمەنـدە حـەزی لەوە بوو گـوێ لـەو باسـە بگرێـت هـەتا ئەدوێـیدا واملێهـات بـاوەڕ بـەوە بکـەم کـە هەر دەیهێنینەدی.

ئەوسـا کانـدی بـە خـەمباری و مرچـومونییەکەوە پرسـی: " کەواتـە.. هـەموو شتێك تەواو ؟"

جــۆرج وەڵاَمــی پرســیارەکەی ئــەوی نەدایــەوە، بــەڵاَم وتــی: " مانگەکــە هــەمووی بــە ئــیش کــردن بەســەردەبەم و پــەنجا دۆلارەکــەی خــۆم وەردەگــرم و شــەوێکی تــەواو لــە قەحپەخانەیــەکی بــەدو چــەپەڵدا بەســەردەبەم و دەمێنمــەوە، یــاخود دەچــمە خانەیــەکی بیلیــاردو هــەتا هــەموو کەســێك بــۆ مــاڵی خــۆی دەڕواتــەوە مــن هــەر لــەوێ دەبم ئەوسـا دەگەڕێمـەوە ئێـرەو مـانگێکی دیکـە کـار دەکەم و پەنجا دۆلاری تر وەردەگرم و..."

دوای ئـەوە کانـدی وتـی: " پیـاوێکی ئەوەنـدە بـاش بـوو هـیچ بـاوەڕم نـەدەکرد شتێکی ئاوا بکات."

جـۆرج کـە هێـشتا هـەر چـاوی لـە ژنەکـەی کێـرلی بڕیبـوو، وتـی: " لێنـی هـەرگیز بـە نییـەتێکی شـەڕانگێزانەوە ئەمـەی ئـەنجام نـەداوە.. هـەموو کاتێـك شـتی خراپـی کـردووە، بـەڵاَم هـیچ شـتێکی بـە نییـەتێکی خراپـەوە نـەکردووە."

پـاش ئـەوە ڕاسـت بـووەوەو ئـاوڕی لـە کانـدی دایـەوەو وتـی: " گـوێبگرە کانـدی.. دەبـێ بـچین پیاوەکـان ئاگـادار بکەینـەوە. وابـزانم باشـتروایە بیگـرن و بـۆ ئێـرە بیهێننـەوە. هـیچ چارەیەکی ترمـان نییـە.. ئەوانەشـە ئـازاری نـەدەن.." دواتـر بـە

پێداگرییەوە وتی: " من ڕێگایان نادەم دەست بە لێنییەوە بدەن. چاك گوێم لێبگرە ئێستا.. ئەوانەیە پیاوەکان وابزانن دەستی منیشی تێدایە.. بۆیە من دەچمە خانووی کرێکاران و دوای ئەوە تۆ بە ماوەیەکی کورت وەرە دەرەوەو برۆ دەربارەی ئافرەتەکە ئەوانی تر تێ بگەیەنە.. ئەوسا منیش لەگەڵیاندا دێم و خۆم والێدەکەم کە ئەم بینیووە و ئاگام لە هیچ شتێك نییە.. ئەوەم بۆ دەکەیت؟ بۆ ئەوەی پیاوەکان بیر لەوە نەکەنەوە کە دەستی منیشی تیادایە؟"

کاندیش وتی: " بەڵێ... جۆرج... بێگومان ئەو کارە ڕادەپەڕێنم."

"دەباشە کەواتە دوو دەقیقە مۆڵەتم بدەو ئەوسا بە هەڵەداوان وەرە دەرەوەو بەو شێوەیە پێیان بڵێ کە ئەو ئانوساتە ئەوت بینیبێ. دەی ئەوا من دەڕۆم." پاشان جۆرج وەرسووڕایەوە و بە پەلە پەل لە تەویلەکەوە چووە دەرێ. کاندییە پیریش چاودێری ڕۆیشتنی کردو دواتر دۆشداماوانە ناوڕی لە ژنەکەی کێرلی دایەوەو سەیری کرد، ئەوسا هێدی هێدی ناخۆشی و خەم و پەژارەکەی چووە نێو قاڵبی ئاخاوتنەوەو دڕندانە وتی: " هەی قەحپەی لەعنەتیی، ئاخرییەکەی نەهامەتییەکت نایەوە، ها... وانییە؟ پێم وایە هەنووکە ئیتر بەختەوەری. هەموو کەسێك درکی بەوەکرد بوو کە تۆ شتەکان کاژوواژ دەکەیت و سەرئێشەیەکی گەورە دەنێیتەوە. تۆ ئەوسا هیچ سوودێکت نەبوو، ئێستاکەیش هیچ سوودێکت نییە هەی سووك و چرووکی چەپەڵ.." ئەو دەم فینگەو لووشە لووشێکی کردو دەنگی پەشۆکاو وتی: " بۆ خۆم دەمتوانی لە باخچەکەدا بژار بکەم و قاپ و قاچاخیش بۆ ئەو پیاوانە بشۆرم."

پاشان قەدەرێك ڕاوەستاو ئینجا بە تەرزێکی یەکنەوایانە درێژەی دایێ و کەوتە دووپات کردنەوەی قسە کۆنەکان و وتی: " ئەگەر تاقمی سێرکیش بهاتبانایە ناوشار یاخود یارییەکی بەیسبۆڵ بکرابایە ئەوا دەستبەجێ بۆ بنینی دەچووین.. ئیشمان هەواڵەی جەهەننەم دەکردو گوێمان نەدەداو بۆ بینینی دەچووین.. هەرگیزیش داوای مۆڵەتمان لە کەس نەدەکرد.. بەرازو

مریشکیـشمان دەبـوو... لـە زستانیـشدا.. زۆپـاو ئاگردانـە بـچکۆلە قەبەکـەمان دادەگیرسـاند.. بـارانیش خـوڕ خـوڕ دەبـاری.. ئێمـەیش لـەوێ دادەسـەکناین.. "

ئـیتر ئەشـك چـاوەکانی لێـڵ کـرد، وەرچـەرخاو بـە کۆتـەرەی مەچـەکی ڕیـشە زبرەکـەی خورانـد و بـە دەسـتەو سـانییەکەوە لـە تەویلەکـەوە چـووە دەرێ، لـەوێ لـە دەرەوەدا غەڵبەغـەڵبی یارییەکـە دامرکـابووەوەو دەنگـە دەنگـی مـشتومڕی پیاوەکـان بلّنـد ببـووەوە، تەپـە تـەپی کۆمـەڵێك پێـی ڕاکـردوو بیـستراو هـەموویان خۆیـان تەپانـدە نێـو تەویلەکـەوە. سلیم و کارلـسۆن و ویتیـی نەوجـەوان و کێـرلی و.. کـرووکس... هاتنـە ژوورەوە... بـۆ ئـەوەیش کـە کـرووکس سـەرنجی کـەس بـەلای خۆیـدا ڕانەکێـشێ لەگـەڵیان مەودایـەکی باشـی وەرگـرت و لـە پـشتەوە وەسـتا. کانـدی دوای ئـەوان هـات و دوای هـەر هەموویـشیان ئینجـا جـۆرج هـات. جـۆرج پـاڵتۆ شـینە دێنیمەکـەی خـۆی ئەبـەرکردبوو دوگمەکانیـشی داخـستبوو، شـەپقە ڕەشەکەشـی بەسەرچـاوەکانیدا دادابـووە خـوارەوە. پیاوەکـان بـە هەڵپـە هـەڵپ بـەدەوری دوا خانـەی نێـو تەویلەکـەدا هاتنـە ژوورەوە و چـاوەکانیان لـەناو تاریکاییەکـەدا ژنەکـەی کێـرلی بـەدی کـرد.. ڕاوەسـتان.. بـێ جووڵـەو کـرەك ڕاوەستان و چاویان تێ بری.

ئەوسا سـلیم بـە وریـایی و هێمنییەکـەوە لێـی نزیـك کەوتـەوەو دەسـتی خـستە سـەر مەچـەکی و ترپـەی دڵـی گـرت.. دواجـار قـامکێکی باریکەلـەی لـە ڕوومـەتی خـشاندو پاشـان دەسـتی خـستە ژێـر ملییـەوە کـە نـەختێك گێـرولار ببـووەوەو بـە قامکـەکانی کەوتـە پـشکنینی. کـاتێکیش کـە هەسـتایەوە پیاوەکـان لـە تەنیشتیدا ئاپۆرایان بەستبوو، جگە لەوە تەنیـمی بێدەنگییەکەیش شکابوو.

کێـرلی کتـوپڕ گیـانی تێکـەڕاوهاواری کـرد: " دەزانم کـێ کردویەتـی، ئـەو دێـوە زەبەللاحـە قەحپـە دایکـە کردویەتی. دەزانم کـە ئـەو کردویەتـی.. چـونکە هـەموو ئـەوانی تـر لـە دەرەوە یـاری نـاڵ ناڵێنیـان دەکـرد." ئەوسـا هێـدی هێـدی کەوتـە نێـو بۆتـەی هەڵـچوون و شـێتگیرییەوە و وتـی: " بـۆ کـوێ دەچـێ.. هـەر دەسـتگیری دەکـەم.. دەڕۆم

تفەنگەکەم دەهێنم.. هەر خۆم ئەو کوڕی قەحپە زەبەللاحە دەکوژم.. لە هەناوی دەدەم.. دەی وەرن کوڕینە با بڕۆین.." ئەوەی وت و بە خەشمێکی بێزارەوە لە تەویلەکەوە دەرپەڕی و ڕۆیشت. کارلسۆنیش وتی: " منیش دەچم لوگەرەکەی خۆم دەهێنم." و ئەویش بە پەلە ڕایکردە دەرەوە.

ئینجا سلیم بە هێمنییەکەوە ئاوڕی لە جۆرج دایەوەو وتی: " بەڕاستی پێم وایە لێنی ئەم کارەی کردووە، ملی شکاوە. هەر بە تەنها لێنیش دەتوانێ ئەوە بکات."

جۆرج پاسخی نەدایەوە، بەڵام بە هێورییەکەوە سەری ڕاوەشاند. شەپقەکەشی ئەمەندە بەسەر تەوێڵیدا لار ببووەوە کە چاوەکانی شاردبووەوە و دیار نەبوون. ئەوسا سلیم درێژەی دایێ و وتی: " ڕەنگە ئەمەیش هەروەکو ئەوەی ئەو کاتەی وید بێت کە تۆ بۆت باس کردین."

دووبارە جۆرج سەری ڕاوەشاندەوە.

سلیمیش ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: " کەوابێ پێویستە دەستگیری بکەین. بەڕای تۆ دەبێ بۆ کوێ ڕۆیشتبێ؟"

ماوەیەکی درێژی خایاند هەتا جۆرج توانی وشەکانی ڕەها بکات و بدوێت. " دەبێ بەرەو باشوور چووبێت، چونکە ئێمە لەلای باکوورەوە هاتین، لەبەرئەوە هەر دەبێ بەرەو باشوور چووبێت."

سلیم دووبارە وتی: " هەرچی چۆنێك بێت دەبێ بیگرین."

ئینجا جۆرج لێی هاتە پێشەوەو وتی: " ئەی ناتوانین بیهێنین و لێرە فرێی بدەینە زیندانەوە؟ خۆ تەواو شێتە سلیم.. قەتیش بە نییەتێکی شەڕانگێزانەوە ئەمەی ئەنجام نەداوە."

سلیمیش سەری لەقاندو وتی: " لەوانەیە بتوانین.. ئەگەر بتوانین دەرچوونی کێرلی قۆرخ بکەین، بەو شێوەیە دەتوانین. بەڵام کێرلی دەیەوێ بیکوژێت، چونکە هێشتاپش هەر دەربارەی دەستی دڵ پڕ لەقین و تووڕەییە لێی. جا گریمان فڕێیان دایە

زینـدان.. کـۆت و بەنـدیان کـردو ئاخنییانـە قەفەزێکـەوە، خـۆ ئـەوە شـتێکی زۆر مـاقووڵ نییە جۆرج." جۆرجیش وتی: " دەزانم.. دەزانم."

دواجـار کارڵـسۆن بـەراکردن هاتـە ژووردوەو قیژانـدی: " ئـەو کـوری قەحپەیـە لوگەرەکـەمی دزیـووە، لـە جانتاکەمـدا نییـە." ئـەنجا کێـرلی بەدوایـدا هاتـە ژوورەوەو بەدەسـتـە سـاغەکەی تفەنگەکـەی خـۆی هـەڵگرتبوو، ئـیتر هەڵـچوونەکەی دامرکـابووەوەو وتـی: " دە باشـە دەی کورینـە بـابرۆین، کارڵسۆن، قولەرەشـەکە تفـەنگێکی هەیـە تـۆش ئـەوە بهێنـە. هـەر کـە بینیـت هـیچ بـوارو دەرفـەتی مـەدە، یەکـسەر فیـشەکێك ئاراستەی ورگ و ریخۆڵـەی بکـە، ئا ئەوە دوو پارچەی دەکات."

ویتیش بە شێوەیەکی هەڵچووانە وتی: " من تفەنگم نییە."

کێـرلیش وتـی: " تـۆ بـرۆ بـۆ سـۆڵێداد و پۆلیـسێك بهێنـە.. ئـا.. ئـال ویلتـز بێنـە، جێگـری سـەرۆکی پۆلیـسە.. دەی بـابرۆین ئـیتر.." ئینجـا بـە بەدگومانییەکـەوە لـە جـۆرج وەرسـوورایەوە و پیـێ وت: " ئـەی تـۆ لەگـەڵمان دێیت برادەر؟"

جـۆرجیش وتـی: " ئـا.. لەگەڵتانـدا دێـم.. بـەلام گـوێبگرە کێـرلی.. ئـەو حەرامزادە نەگبەتە شرۆشێتە، مەیکوژە. بەڕاستی نەیزانیووە چی دەکات."

کێـرلیش هـاواری کـرد: " نـەیکوژم.. هـا ؟ لوگەرەکـەی کارڵسۆنیـشی پێیـە، هەر دەبێ بیکوژین."

ئەوسـا جـۆرج بـە ناسـکی و نەرمییەکـەوە وتـی: " جـا لەوانەیـە کارڵـسۆن خۆی دەمانچەکەی ونکردبێ."

کارڵـسۆنیش وتـی: " مـن ئـەم بەیانییـە بینـیم، نـەخێر.. نـەخێر.. دەمانچەکەم براوە."

سـلیمیش لـە کاتێکـدا کـە راوەسـتا بـوو دەیروانییـە ژنەکـەی کێـرلی وتـی: " کێرلی.. باشتر وایە لێرە لای ژنەکەتدا بمێنیتەوە."

بەلام سیمای کێرلی سوورهەلگەڕاو وتی: " نا.. من دەڕۆم.. خۆم، بەدەستی خۆم دەبێ ورگی ئەو قەحپە دایکە زەبەللاحە هەلڕێژمە دەرەوە و بیکوژم... هەتا ئەگەر هەریەك دەستیشم هەبێ ئەوا ئەو کوڕی قەحپەیە دەکوژم."

ئینجا سلیم لە کاندی وەرچەرخاو وتی: " کەواتە تۆ لەگەلّ لاشەکەدا بمێنەرەوە کاندی. ئێمەیش وا باشە بکەوینە ڕێ."

ئەوسا هەموویان کەوتنەڕێ و ڕۆیشتن.. جۆرج ماوەیەك لە تەنیشت کاندی ڕاوەستا.. هەردووکیان پێکەوە تەماشای ژنە مردووەکەیان کرد هەتاکو کێرلی بانگی کردو وتی: "گوێبگرە جۆرج! تۆش لەگەلّ ئێمە وەرە بۆ ئەوەی بیرلەوە نەکەینەوە کە ئەم تاوانە دەستی تۆیشی تێدا بووە."

ئەوسا ئیتر جۆرج بە سەنگینیی پێیەکانی خۆی بەکێش کردو بەهێواشی دوایان کەوت. کاتێکیش کە هەموویان ڕۆیشتن و دیارنەمان، کاندی بە چیچکانەوە لەنێو کایەکەدا دانیشت و لە دەموچاوی ژنەکەی کێرلی ڕاماو بە دەنگێکی ناسکەوە وتی: " هەی قەنەندەری چارەڕەش."

پاشان دەنگە دەنگی پیاوەکان کز تر بووەوە. تەویلەکەیش هەتا دەهات تاریکتر دادەگەڕا و ئەسپەکانیش لەنێو خانەکانی خۆیاندا لاقەکانیان بەزەویدا دەکێشاو قەمتەرە زنجیرییەکانیان زرە زرِی لێوە دەهات. کاندییە پیریش بەباسکی خۆی چاوەکانی داپۆشی و لەنێو کایەکەدا درێژبوو.



ئەو دوانیوەڕۆ درەنگ وەختە پەنگاوی سەوزو قوولّیی ڕووباری سالیناس مەنگ و خامۆش بوو. دەمێك بوو هەتاو لە دۆلّەکەوە بۆ ئەوە پاشەکشەی کردبوو کە بە قەدپالّی چیاکانی گابیلان دا هەلّزنێت.. ترۆپکەکانیش لەبەرخۆرەتاوەکەدا گولگوون هەلّگەڕابوون. بەلام لەولاوە لە بەستێنی پەنگاوە

مەنگەکـەدا، تاریکاییـەکی دڵفـڕێن هـەژموونی بەسـەر مـابێنی سوورەچـنارە پەڵەپـە لاوییەکانـدا کردبـوو. مـارێکی ئـاویی بـە ئەسپایی و سـانا گۆماوەکـەی بـە هـەڵخزان دەبـڕی و سـەرە پێرۆسـکۆپییەکەی تـەکان دەداو بـەملاو بـەولادا دەیجوولانـدەوە. بەمەلـە سەرانـسەر پەنگاوەکـەی بـڕی و گەیـشتە لای لاقـە درێـژەکانی ئـەو شینەشـاهۆیەی کـە مەنـدو کـڕەك لـە تەنکاوەکـەدا ڕاوەسـتابوو. لـە پڕێکـدا سـەرو دەنووکـە کـش و ماتەکـەی هاویـشتە نێـو ئاوەکـەوە و بەسـەر مارەکـەی قۆزتـەوە و دەردی هێنایـە دەرەوە.. دەنووکەکـە سـەری مـارە بـچکۆلانەکەی قـوت داو کلکیـشی بە شپرزەیی هێشتا هەر لە دەرەوە فڕکە فڕکی بوو.

لـە دوورەوە هـورووژمی بایـەك هاتـە بـەرگوێ و پاشـان ڕەشـەبایەك وێنـەی شـەپۆل لـەمیانی سـەروپۆپەی درەختەکانـەوە گـوزەری کـرد. گـەلای سـوورە چـنارەکانیش هەڵگەڕانـەوەو دیـووە زیوویـنـەکانیان دەرکـەوت، گـەلا قـاوەیی و وشـك هەڵگـەڕاوەکانی سـەر عەرزەکـەیش چـەند هـەنگاوێك دوورکەوتنـەوە و بـای هـەڵکردووش ڕیـز لـە دوای ڕیـز وردە شـەپۆلی لەسـەر ڕووی سـەوزی پەنگاوەکـەدا دروست دەکردو ڕایدەماڵین.

بایەکـە چـەند بـە خێرایـی دەسـتی پێکـرد بـوو هـەر ئـەئاوایش دامرکایـەوەو سـەر لـە نـوێ زێـوارو دەورووبەرەکـە ئـارامیی تێگەڕایـەوە. شـینە شـاهۆکە لـە تەنکاییەکـەدا هـەروا کـشومات ڕاوەسـتا بـوو چـاوەڕوانیی دەکـرد. مـارێکی ئـاویی بـچکۆلانەی دیکـەیش لـەنێو پەنگاوەکـەوە بـەرەو ژوور مەلـەی دەکـردو سـەرە پێرۆسکۆپییەکەی لەملاوەبۆئەولا دەجوولاندەوە.

هێنـدەی پێنەچـوو لێنـی لـەناو بێـشەلانەکانەوە دەرکـەوت، هـەروەکو چـۆن ورچـێك بـە بێـدەنگیی پێـدزە دەکـات و دەجوولێتـەوە ئـەویش ناوهـا لـەوێ دەرکـەوت. شـینە شـاهۆکە لـە نێـو ئاوەکـەوە بلنـد بـووەوەو لـە شـەقەی بـاڵی داو بەسـەر ڕووبارەکـەدا هـەڵفڕی و دوورکەوتـەوە. مـارە بـچووکەکەیش داخزایـە نێـو قامیشەلانەکەی گوێی پەنگاوەکە و بزر بوو.

لێنــی بــە بێدەنگییەیــەکی بێوێنــەوە لــە قــەراخی گۆماوەکــە نزیــك بــووەوە. چــۆکی داداو کەوتــە نــاو خواردنــەوە، بــەجۆرێك نــاوی دەخــواردەوە بــەحاڵ لێوەکــانی بەرناوەکــە دەکــەوتن. کــاتێکیش کــە پەلــەوەرێکی چــکۆلانە بــە تیــژی بەســەر گــەڵا وشــك هەڵگــەڕاوەکانی پــشتەوەیدا ڕابــوورد، دەمودەســت ســەری هــەڵبڕی و بەچــاوو گوێــچکەکانی ســەرنجی خــۆی بــەلای دەنگەکــەدا ڕاکێــشا و مــات بــوو هــەتا باڵندەکــەی بینی، ئەوسا سەری نەوی کردەوەو سەرلەنوێ کەوتەوە ئاو خواردن.

کاتێــك کــە تێــر نــاو بــوو، لەســەر کــەناری رووبارەکــە ڕوو لــە پەنگاوەکــە دانیــشت بــۆ ئــەوەی بتــوانێ چــاودێریی ســەرتاپای ڕێگاکــە بکــات. پاشــان ئــەژنۆکانی لــە ئامێزنــاو چــەناگەی خــستە ســەریان. ئــەو رووناکییــەی کــە دۆڵەکــەی بــەجێ هێــشتبوو، بــەرزببووەوە، تــا دەهــات دوورتــر دەکەوتــەوە و بــە ڕووناکییــەکی هێندەی تر بێهاوتا نوتکەی کێوەکانی دەدرەوشاندەوە.

لێنی لەگەڵ خۆیدا کەوتە قسەو بە هێمنیی وتی: " بێگومـان لـە یـادم نەچووە. خــۆم لــە نابــەینی بێــشەڵانەکاندا حەشــاردەدەم و چــاوەڕوانیی هــاتنی جــۆرج دەبم." ئینجــا شــەپقەکەی بەســەر چــاوەکانیا لارکــردەوەو بــەردەوامبوو: " دەزانم... جــۆرج سەرزەنــشتم دەکـات. خۆزگـە دەخـوازێ تـەنیا بوایـە و مـن ئەوەنـدە گێرمـەو کێشەم بـۆ نەخولقاندایــە." پاشــان ســەری وەرســووڕاندەوە و لــە پۆپــەی درەوشــاوەی کــەژەکان ڕامــاو بــە غەمگینییەکــەوە درێــژەی دایــێ." دەتــوانم ڕێــك بــۆ ئــەوێ بــڕۆم و نەشــکەوتێك بدۆزمــەوەو.. ئــیتر هــەرگیز تــامی کێچاپ نەکــەم.. بــەڵام گــرنگ نییــە.. ئەگەر جۆرج منی نەوێت... ئەوا دەڕۆم.. دەڕۆم و وندەبم.."

ئـا لـەو سـاتە وەختـەدا ژنێکـی بەسـاڵدا کـەوتووی کولەبنـەی قەڵـەو لـە هـزری لێنییـەوە هاتـە دەرێ. چـاویلکەیەکی شووشـە قـۆقزی ئەسـتووری لـە چـاودا بـوو، بەرکۆشـەیەکی گیرفانـداری زۆر زلی خەتخەتیـشی لەبـەردابوو، گـەلێك پاکوخـاوێن و تـەرپۆش و ڕێکـو پێـك بـوو. لەبـەردەم لێنـی دا ڕاوەسـتاو دەسـتەکانی خـستە سەر سمتی و چرچاوی بەیەکاداو بەسەر زەنشت کردنەوە لێی نواڕی.

کاتێکیش کە دەستی بە قسەکردن کرد، دەنگی لێنی خۆی بوو قسەی دەکرد. پێی وت: " هەر پێم وتی و.. پێم وتی بەقسەی جۆرج بکە، چونکە کوڕێکی زۆر ڕێکوپێکەو تۆیشی زۆر خۆش دەوێت.. بەلام قەت گوێ بە هیچ شتێك نادەیت و هەر شتی ناپەسەندو خراپ دەکەیت."

لێنیش پاکۆی دایەوەو وتی: " زۆر هەولم دا پوورە کلارا. هەر هەولم داو هەولم دا. بەدەست خۆم نییە هیچم پێنەکرا."

ئەویش هەر بە دەنگی لێنی لەسەری ڕۆیشت و وتی: " تۆ هیچ بیرلە جۆرج ناکەیتەوە، کە هەمیشە شتی باشی بۆت کردووە. هەر کاتێکیش پارچە شیرینییەکی دەست کەوتبێ نیوە یاخود زیاتر لە نیوەی بە تۆ داوە. ئەگەر کێچاپیشی دەستکەوتبێ ئەوا هەر هەمووی بە تۆ بەخشیوە."

لێنیش بە غەمبارییەکەوە وتی: " دەزانم.. بەلام زۆر هەولم دا پوورە کلارا. هەر هەولم دا و هەولم دا..."

ئەویش قسەکەی پێبڕی و وتی: " ئەگەر تۆ نەبوویتایە ئەو هەتا هەتایە خۆش گوزەران دەبوو. دەیتوانی پارەکەی خۆی وەربگرێ و بچێتە قەحپەخانەیەکەوە و ڕابویرێ و سەرو سەدایەك بخاتەڕێ، دەیتوانی بچێتە بیلیاردخانەیەکەوە و بەیاری بیلیارد کات بەسەر بەرێت. بەلام دەبوایە بە تۆوە سەرقال بێت."

ئەنجا لێنی بە خەم و خەفەتێکەوە نالاندی و وتی: " دەزانم.. پوورە کلارا. ڕێك دەڕۆم بۆ نێو ئەو زوورگانە و لەوێ ئەشکەوتێك دەدۆزمەوەو تیایدا دەژیم بۆ ئەوەی چیدی بۆ جۆرج نەبمە کوێرەوەریی.

ئەویش بە توورەییەکەوە وتی: " تۆ هەروا دەلێیت، تۆ هەمیشە هەروا دەلێیت، بەلام ئەمەندەیش دایك حیزیی کە قەتاو قەت ئەوە ناکەیت. هەر لە دەوروبەردا دەبیت و هەردەم جۆرج تووشی دلەڕاوکێ دەکەیت و ناخۆشی پێ دەچێژیت."

لێنیش وتی: " لەوانەیە واباشتر بێ بڕۆم، چونکە جۆرج ئیتر ناهێلێت کەروێشك پەروەردە بکەم."

ئینجا لە پرێکا پووره کلارا دیارنەماو لەزەینیی لێنییەوە کەروێشکێکی زەبەللاح دەرکەوت.لەبەردەمیدا لەسەر پاشەڵی دانیشت و گوێچکەکانی لەقاندەوەو بەمشە مشێکەوە لووتی لێ نزیك خستەوە.

ئەویش هەر بە دەنگی لێنی خۆی قسەی کردو بەرپشخەندێکەوە وتی: " کەروێشك بەخێو دەکەیت، هەی شرۆشێتی سەگباب. تۆ تەنانەت شایستەی ئەوە نیت کە قاچی کەروێشکیش بلێسیتەوە.. تۆ لەبیریان دەکەیت و برسی و تینوو بەجێیان دەهێڵیت.. بەڵێ ئا ئەوەیان لەگەڵدا دەکەیت. جا ئەو کاتە جۆرج چیت پێ دەڵێت؟"

لێنیش بەدەنگێکی بەرز وتی: " نا.. لەبیرم ناچێت.."

کەروێشکەکەیش وتی: " بەڵێ... لەبیرت ناچێت.. بەخوا هیچ و پووچیت.. تۆ تەنانەت ئەو شەقەیش ناهێنی کە هەڵتدەداتە دۆزەخەوە. خوا خۆی دەزانێ کە هیچ شتێك نەما جۆرج نەیکات بۆ ئەوەی لەزێرابەکە دەرت بێنێ، وەلێ هیچ کەڵکی نەبوو. ئەگەر لەو بڕوایەشدا بیت کە جۆرج دەهێڵێ کەروێشك پەروەردە بکەیت، ئەوا لە گەمژەیش گەمژەتری. هەرگیز ناهێڵێت.. ڕاوەستە بزانە چیت لێدەکات.. بەتێلا لێدانێکت لێ دەدا دۆزەخ بە چاوی خۆت ببینی.. ئا هەر وا دەکات.. تێرو پڕت لێ دەدات."

ئینجا لێنی یەکسەر وەلامی دایەوەو شەڕانگێزانە وتی: " ئەو شتی وا ناکات.. جۆرج بەهیچ شێوەیەك شتی لەو جۆرە ناکات. چونکە دەمێکە دەیناسم، لەبیرم چووە لەکەیەوە جۆرج دەناسم، بەلام دەمێکە.. هەرگیزی لێی نەداوم و داری لێ هەڵ نەگرتووم.. منی زۆر خۆش دەوێت.. قەت بەرامبەرم دڵڕەق و خراپ نابێت."

کەروێشکەکەیش وتی: " بەلام ئیتر تەواو لێت بێزارو جاڕس بووە، تێلاترێنێکی چاکت دەکات و دوای ئەوە بەجێت دەهێڵێت و دەڕوات."

لێنیش بەشێتگیرییەکەوە هاواری کرد: " نەخێر.. ئەو وا ناکات.. ئەو هەرگیز شتی لەو بابەتە ناکات.. من جۆرج دەناسم. من و ئەو هاوڕێ بووین و بۆ هەموو لایەك پێکەوە دەڕۆیشتین."

بەلاّم کەروێشکەکە بە ئاستەم و هێمنییەوە قسەکانی خۆی چەند بارە کردەوەو وتی: " سا بزانە چۆن بەجێت دەهێڵێ هەی شرۆشیتی دایك حیز... بەتاق و تەنیا بەجێت دەهێڵێت.. بەجێت دەهێڵێ.. تۆی شرۆشیتی حورچ و سەگباب بەجێ دەهێڵێت."

ئەوسا لێنی دەستی خستە سەر گوێیەکانی و شیتاندی: " نا... جۆرج وا ناکات.. نا.. من پێت دەڵێم جۆرج وا ناکات... ئاه.. جۆرج.. جۆرج.. جۆرج!"

دوای ئەوە دەستبەجێ جۆرج بە بێدەنگییەوە لەمیان لێرەکانەوە هاتە دەرەوەو کەروێشکەکەیش بە پەلە پرووزێ گەڕایەوە نێو ناوەزی لێنی و پێوار بوو.

جۆرجیش بە هێورییەوە لێی پرسی: " ئەم هەموو هاوار هاوارەت لە چییە؟"

لێنیش هەستایە سەرئەژنۆکانی و وتی: " خۆ بەتەنیا جێم ناهێڵیت جۆرج.. وانییە؟" من دەزانم تۆ بەتەنیا جێم ناهێڵی."

پاشان جۆرج بە گورج و گۆڵیی لێی هاتە پێشەوە و لەتەنیشتیدا دانیشت و وتی: " نا." ئەوسا لێنی قیژاندی: " دەمزانی... دەمزانی تۆ لەو جۆرە پیاوانە نیت."

جۆرج ورتەی لێوە نەهات.

لێنیش وتی: " جۆرج."

"ها، چیت دەوێ؟"

"هەمدیس شتێکی خراپم کرد."

جۆرجیش وتی: " جا خۆ هیچ فەرقێك ناکات." و سەرلەنوێ بێدەنگ بووەوە. ئێستاکە ئیتر هەر تەنها بەرزترین ترۆپك لەناو ڕۆشنایی هەتاودا مابووەوە. تاریکی ناو دۆڵەکە شینێکی سافی کەمڕەنگ بوو. لە دوورەوە دەنگی چەردە پیاوێك دەهاتە بەرگوێ کە بانگی یەکیان دەکردو دەیان شیتاند. جۆرج سەری بەلای شیتە شیتەکەدا وەرسووڕاندو کەوتە گوێ شل کردن.

لێنی وتی: " جۆرج. "

"ها، چیت دەوێ؟"

"ئەی سەرزەنشتم ناکەیت؟"

"سەرزەنشتت بکەم؟"

"بەڵێ.. وەکو چۆن جاران هەمیشە سەرزەنشتت دەکردم. وەکو ئەوەی کە دەتوت: " ئەگەر تۆم لەگەڵ نەبوویتایە ئەوا پەنجا دۆلارەکەی خۆم وەردەگرت و.."

"بۆ خاتری خوا لێنی تۆ چیت! هیچ شتێکت نایەتەوە بیر کەڕووی داوە.. بەڵام هەموو وشەیەکت لەبیرە کە من وتوومە."

"کەواتە ئەو قسانەم پێ ناڵێیت؟"

ئینجا جۆرج خۆی ڕاوەشاندو وشك و برینگ و بێ هەست و خوستانە وتی: " ئەگەر هەر خۆم بوومایە دەمتوانی زۆر خۆشگوزەران بژیم." کە ئەمەی وت دەنگی یەکنەوا بوو. جەختی نەدەکردە سەر وشەکان. دوای تۆزێك سەرومڕبوو وتی: " دەمتوانی کارێك بۆ خۆم پەیدا بکەم و ئاریشە و مەینەتیم نەبێت." دوای ئەمە لە قسەکردن وەستاو بێدەنگ بوو.

لێنیش وتی: " جۆرج توخوا بەردەوام بە.. ئەی پێم بڵێ کاتێك کە کۆتایی مانگ دێت.."

"کاتێکیش کە کۆتایی مانگ دێت پەنجا دۆلارەکەی خۆم وەردەگرم و بۆ.. قەحپەخانەیەك.. دەڕۆم..." دووبارە وەستاو بێدەنگ بووەوە.

لێنیش بە پەرۆشەوە تەماشای کردو وتی: " جۆرج توخوا بەردەوام بە... ئەی تۆ پێم بڵێ چیدی سەرزەنشتم ناکەیت؟"

جۆرجیش وتی: " نا. "

ئەوسا لێنی وتی: " کەوابێ دەڕۆم... ئەگەر منت ناوێ ئەوا دەمودەست پەنا دەبەمە بەر زوورگەکان و ئەشکەوتێك بۆ خۆم دەدۆزمەوە..."

جۆرج دیسانەوە خۆی ڕاوەشاندو وتی: " نا...من دەمەوێ تۆ لەگەڵ مندا لێرە بمێنیتەوە."

لێنیش فێڵبازانە وتی: " دە باشە باسم بۆ بکە، هەروەکو چۆن پێشتر هەمیشە بۆت باس دەکردم."

"باسی چیت بۆ بکەم؟"

"باسی ئێمە و پیاوانی دیکەم بۆ بکە."

جۆرجیش وتی: " پیاوانی وەکو ئێمە کەس و کاریان نییە. پارەیەکی ناچیزیش پەیدا دەکەن و زوو بە زوو بە فیڕۆی دەدەن. هیچ دۆست و کەس و کارێکیشیان لە دانی دنیادا نییە گوێیان بداتێ و بیریان لێبکاتەوە..."

لێنیش بەشادمانییەکەوە وتی: " بەلاّم ئێمە وانین.. دە باسی ئێمە بکە.. ئێمە چۆنین؟"

جۆرج بۆ قەدەرێك کش و مات بوو دواجار وتی: " بەلاّم ئێمە وانین."

"لەبەرچی."

"لەبەرئەوەی من تۆم هەیەو..."

ئیتر لێنی بە خۆشحاڵی و سەرفیرازییەکەوە هاواری کرد: " منیش تۆم هەیە.. چونکە یەکترمان هەیە، بۆیە، بایەخ بە یەك دەدەین و بیر لە یەکتر دەکەینەوە."

لەو ئانوساتەدا سروەی ئێواریٚ بەسەر عەرزە ڕوتەلانەکەدا هەڵی کردو گەلاکان کەوتنە خشەخش.. شەپۆلی بایەکەیش ئاوی سەوزباوی پەنگاوەکەی خستە ڕەوت و لەرەلەرەوە.. شیتەو دادو فریادی پیاوەکان سەر لەنویٚ بیسترایەوە، بەلاّم ئەم کەرەتە زۆر لەوەی پێشوو نزیکتر بوو.

جۆرج شەپقەکەی داکەندو بەدەنگێکی لەرزۆك و شپرزەوە وتی: " لێنی شەپقەکەت داکەنە... کەشوباکەی زۆر خۆش و نایابە."

لێنیش گەردن کەچانە شەپقەکەی داکەند و لەسەر زەوییەکە لەبەردەم خۆیدا داینا. نوتەکیی نێو دۆڵەکە شینتر هەڵگەڕا بوو.. ئێوارەیش پێشوەخت و زوو داهاتبوو.. بایەکە دەنگی شکان و هاڕە هاڕو خشەخشی نێو بێشەلانەکەی وەبەر گوێیان دەدا.

ئەوسا لێنی وتی: " باسی ئەوە بکە کە دوایی چۆن چۆنی دەبێت.."

جۆرج گوێ قولاغی دەنگ و ژاوە ژاوە دوورەکە بوو، بۆ ساتۆکەیەك جیددی بوون بەسەریدا زاڵ بوو، بە هێمنیی پێی وت: " لێنی بنۆڕە ئەوبەری ڕووبارەکە، من بۆتی باسی دەکەم بۆ ئەوەی تۆیش بتوانی وێنای بکەیت و بیبینی."

ئیتر لێنی سەری وەرگێڕاو چاوی بڕییە ئەوبەری پەنگاوەکە و قەدپاڵی تاریك داگەڕاوی شاخەکانی گابیلان.

جۆرج دەستی پێکردو وتی: " مەزرایەکی بچکۆلانە دەستەبەر دەکەین.." ئەمەی وت و دەستی خستە لا گیرفانێکی و لوگەرەکەی کارلسۆنی دەرهێنا. زمانەی دڵنیایی دەمانچەکەی ترازاندو دەست و دەمانچەکەشی لەسەر زەوییەکە لە پشتی لێنییەوە دانا. پاشان تەماشای پشتەسەری لێنی کرد. ڕێك دیقەتی ئەو شوێنەی دا کە تیایدا موورەگەی پشت لەگەڵ کاسەی سەردا یەکیان گرتووە.

لەسەرووی ڕووبارەکەوە پیاوێك بانگی کردو پیاوێکی تریش وەڵامی دایەوە. ئینجا لێنی وتی: " دە توخوا بەردەوام بە.."

جۆرج دەمانچەکەی بەرزکردەوەو دەستی کەوتە هەڵلەرزین.. ئەوسا ئەویش دەستی داگرتەوەو خستییەوە سەر زەوییەکە.

لێنی دووبارە وتی: " دە دەی.. قسە بکە.. دوایی چۆن دەبێت.. ئێ.. مەزرایەکی بچووکمان دەبێت.."

جۆرجیش وتی: " مانگایەکمان دەبێت.. لەوانەیە بەرازێکیشمان هەبێت و هەندێك مریشکیش بۆچاندنی وێنجەیش لەسەر مەزراکەدا پارچە زەوییەکمان دەبێت..."

لێنی ئەوسا بە خۆشحاڵییەکەوە قیژاندی." بۆ کەروێشکەکان."

جۆرجیش دووبارەی کردەوەو وتی: " بۆ کەروێشکەکان."

"کەروێشکەکان من بەخێویان دەکەم."

"کەروێشکەکان تۆ بەخێویان دەکەیت."

لێنی لە خۆشیدا بسکەی دەهات و بە جۆرجی وت: " بە بەروبوومەکەشی وەکو پادشا دەژین."

"بەڵێ."

لێنی سەریوەرسووراندو ئاوڕی دایەوە.

"نا... لێنی وانا... تەماشای ئەوێ بکە، تەماشای ئەوبەری ڕووبارەکە بکە.. وەکو ئەوەی شوێنەکە بەرجەستە بکەیت و ببینی."

لێنیش بە گوێی کرد و هیچی نەوت. جۆرجیش تەماشای دەمانچەکەی کرد. لەو دەمەیشدا دەنگی شکان و وردو خاش بوونی ژێر ئەو هەنگاوانە دەهات کە لە نێو بێشەلانەکە لە ڕۆیشتندا بوون. جۆرج ئاوڕی دایەوەو تەماشای سەرچاوەی دەنگەکەی کرد.

"دەتوخوا بەردەوام بە جۆرج. کەی دەیکرین و ئەم شتانە دەکەین؟"

"بەم زووانە دەیکەین."

"هەردووکمان."

"هەردووکمان.. ئەوسایش هەموو کەسێك بە جوانیی ڕەفتارت لەگەڵدا دەکات.. چیدیش ئاستەنگ و کێشەمان نابێت.. کەس ئازاری کەس نادات و کەسیش شتی کەس نادزێت.."

ئینجا لێنی وتی: " جۆرج من بەڕاستی وامدەزانی تۆ لێم پەست بوویتە."

جۆرجیش وتی: " نا... نا... لێنی. من لێت پەست نیم... من هیچ کاتێك لێت پەست نەبوومە، ئێستایش لێت دەهری نیم.. ئا ئەمە شتێکە دەمەوێ بیزانیت." جاڕوجەنجاڵەکە نزیکتر ببووەوە. جۆرج دەمانچەکەی هەڵبڕی و گوێی لە دەنگە دەنگەکە ڕادێرا.

لێنی کەوتە پاڕانەوەو وتی: " دەبا هەر ئێستا ئەو پرۆژەیە ئەنجام بدەین.. دەبا هەر ئێستا ئەو مەزرا خشپیلەیە بکڕین."

"باشە بێگومان.. هەر ئێستا... دەبێ بیکرم.. دەبێ جێبەجێی بکەین."

ئیتر جۆرج دەمانچەکەی بەرزکردەوەو ناوها ڕایگرت.. پاشان لوولەکەی لە پشتە سەری لێنی نزیك خستەوەو دەستی بە قایمی و بێووچان کەوتە هەڵلەرزین، بەلاّم پاشتر ڕووخساری سەخت هەڵگەڕاو دەستیشی مەحکەم تر بوو. ئەوسا پەلە پیتکەکەی هێنایەوەو تەقەی کرد... قرمەژنی تەقەکە سەرەتا بە گردەکاندا هەلگژایە سەرەوە و پاشان جارێکی دی داگەڕایەوە خوارێ.. لێنی تەکانێکی داو دەنگێکی ناسازی لێوە دەرپەڕی و بەهێوریی داچۆکاو لەنێو لمەکەدا گیرسایەوە. ئەوسا بەبێ ئەوەی لەرە لەرو جوولاّنەوە بکات لەسەرعەرزەکەدا ڕاکشا.

جۆرج تەزوویەکی بە گیاندا هات و تەماشایەکی دەمانچەکەی کرد، ئەوسا لە خۆی دوور خستەوەو فرێی دا.. لە پشتەوە، لەسەری سەرەوەی کەنارەکەو لە نزیك کەڵەکەی خۆڵەمێشە دێرینەکەدا کەوتە سەر زەوی.

دەنگی هاوارو هەڵلاّ و ڕاکردنی پێی پیاوەکان ئەو دەوروبەرەی نێو بێشەلاّنەکەی ژاوە کرد.. دەنگ و نەڕەی سلیم بەرزبووەوەو بانگی کرد: " جۆرج.. جۆرج.. ئەوە لە کوێیت؟"

وەلێ جۆرج بە سفتی و ڕەقهەڵگەڕاویی لەسەر کەنارەکەدا دانیشتبوو تەماشای دەستی ڕاستی خۆی دەکرد کە دەمانچەکەی پێ تووڕهەڵدابوو. ئەو دەمە کتوپڕ ئەو چەردە پیاوە کە کێرلی پێشیان کەوتبوو ڕژانە نێو ڕوتەلاّنەکەوە. کێرلی.. لێنی بینی لەسەر لمەکەدا درێژبیبوو، وتی: " شوکور بۆ خوا لەناوت برد." پاشان چووە نزیکی و تەماشایەکی وردی کردو ئاوڕی لە جۆرج دایەوەو بە ئەسپایی و ناسکییەکەوە وتی: " ڕێك لە پشتەسەریت داوە."

دواتر سلیم ڕاستەوخۆ چووە لای جۆرج و لە تەنیشتیدا دانیشت، زۆر نزیك لێوەی دانیشت و وتی: " گوێی مەدەرێ.. پیاو هەندێجار پێویستە شتی وایش بکات."

بـەلام کارلـسۆن کـە لەسەرسـەری جـۆرج دا وەسـتابوو لێـی پرسـی: " چـۆن ئەنجامت دا؟"

جۆرجیش پرزە براوانە وەلامی دایەوە." کردم و برایەوە."

"دەمانچەکەی منی پێ بوو؟"

"بەڵێ.. دەمانچەکەی تۆی پێ بوو."

"تۆیش لێت سەندو بەدەستتەوە گرت و کوشتت؟"

"بەڵێ.. ئاوام کرد.."

جـۆرج کـە ئەمـەی وت، تەقریبـەن دەنگـی بـە نـووزەو چـرپە دەچـوو. هێـشتا هـەر ئەبلەقانـە لـە دەسـتی ڕاسـتی خـۆی ڕامـابوو... ئـەو دەسـتەی دەمانـچەکەی هـەڵگرتبوو. ئەوسـا سـلیم نانیـشکی جـۆرجی جەڕانـدو پێـی وت: " دە هەسـتە جۆرج با بڕۆین.. بابڕۆین شتێك پێکەوە بنۆشین."

جـۆرجیش خـۆی دایـە دەسـت سـلیم تـا کۆمـەکی بکـات و بیخاتـە سـەرپێ و وتی: " دە باشە.. باشتێك بنۆشین."

ئەوسـا سـلیم وتـی: " جـۆرج تـۆ ناچـاربوویت ئـەم کـارە بکـەیت.. سـوێند دەخـۆم.. تـۆ ناچـار بوویـت ئـەم کـارە بکـەیت.. دە وەرە ئـیتر بـا بـڕۆین." ئەوسـا هـەتا سـەر ڕێـچکەکە و لەوێـشەوە هـەت سـەر ڕێگـا گـشتییەکە ڕێنومـایی جۆرجی کردو ڕۆیشتن. کێرلی و کارلسۆنیش لە دواوە چاودێرییان دەکردن.

دواسـا کارلـسۆن وتـی: " دە بـۆ خـاتری خـوا.. پـێم بلـێ: ئـا ئەمانـە چـییان لێ بەسەرهاتووە؟"



له ڕۆمانی " مشك و بنیادەم " شتاینبێك بێ چەندو چوون " له ڕۆخدا دەوەستێ " و تاڕادەیەك هەژموونی هونەریی خۆی بەوە وەدی دەهێنێت كه چیرۆكەكەی خۆی له پشێوی و ئاشووبی سالانی ١٩٣٠یەكانی كرێكاران دادەبڕێ و سەردەمێكی كەم شپرزە ترو كەم و روو ژاوتر بەرجەستە دەكات كاتێك كه لانەوازە و بێدەرەتانەكان بەگشت لاو ئاقارێكی هەرێمەكەدا له گەڕان و سووڕاندا بوون، كاتێك كه ئیش و كار له كێلـگە بەرفراوانەكانی دانەوێلـە و باخ و بێستانەكاندا زۆرو زەبەند بوون. هەرتەنها لەوەدا كه شتاینبێك بە "شێوازێك بۆ گەماڕۆدانێكی شموولی"و"دیواری پاشخان" ناودێری كردووە، تێكست سەدای چركە ساتێكی مێژوویی بەرهەم دەهێنێت. هەر له سالانی ١٨٧٠ كانەوە تاوەكو دەوروبەری سالـی ١٩٣٠بەروبوومی دانەوێلـە و میوەجاتی ناوچەیەكی گەورەی كالیفۆرنیا لەلایەن كارگەرە گەڕۆكەكانەوە درەو دەكران و دەچنرانەوە، كه زۆربەیان ئەو پیاو گەلە ڕەبەنانە بوون كه گەڕان و سووڕان ببووە نەریت و خوویان. هەندێكیان پەتووی بچووكی لوول خوارد و یاخود كۆلـەپشتیان بەكۆلـەوە بوو،هەندێكیشیان بەبێ هیچ شتێك كه بیانپارێزێ هەر لەنێو درەختستانەكانی قەراخ جادەكاندا دەخەوتن.





دەزگای توێژینەوەو بڵاوكردنەوەی موكریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی
ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوكردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوكردنەوەی هەولێر

٢٠١١

چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری